گابریل گارسیا مارکیز

# چۆن رۆمان دەنووسرێ ؟

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

رەووف بێگەرد

سلێمانی / ٢٠٠٣

زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی گیرفانی ژمارە ( ٣٦ )

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

# چۆن رۆمان دەنووسرێ ؟

نووسینی: گابریل گارسیا مارکیز
وەرگێڕانی: رەووف بێگەرد
بابەت: وتار
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولرەحمان
هەڵەچن: ساکار-مهاباد-هەوار
تیراژ: ٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن : ی ٢٠٠٣



www.sardam.net

## زۆر چاکە، با لەسەر ئەدەب بدوێین

لە دیمانەیەکی ڕۆژنامەنووسیی کۆندا، خورخە لویس بۆرخیس وتویەتی: کێشەی لاوە نووسەرەکانی ئەو سەردەمە لەوەدا بوو کە دەیاننووسی بیریان لە سەرکەوتن یان نشوستی هێنان دەکردەوە، بەڵام بۆرخیس خۆی، لە سەرەتای نووسینیدا تەنیا بیری لەوە کردۆتەوە ئەو بۆ خۆی دەنووسێت. بۆرخیس دەگێڕێتەوە: "ساڵی ١٩٢٣ یەکەم کتێبم نووسی، سێ سەد دانەم لێ چاپ کرد و بەخشیمە هاوڕێکانم، بێجگە لە سەد دانەی کە بۆ گۆڤاری "نوسوتروس"م برد، یەکێك لە بەڕێوەبەرانی گۆڤارەکە- ئەلفرید و بیانتچی- بە سەرسامییەوە پێی وتم: "دەتەوێت ئەم هەموو کتێبەت بۆ بفرۆشم؟" بۆرخیس وای وەڵام داوەتەوە:

"نەخێر، نا، ئەگەرچی من نووسەری کتێبەکەم، بەڵام شێت نیم"

لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژنامەنووسەی دیمانەکەی سازدابوو (ئەلیکس خ. زیسمان) ئەوسا قوتابییەکی پیرۆیی بوو لە لەندەن دەیخوێند، هەر لە پەراوێزی ئەو چاوپێکەوتنەدا وای گێڕایەوە بۆرخیس پێشنیازی ئەوەی بۆ بیانتچی کردبوو، کاتێك نووسەرەکان پاڵتاوەکانیان بە چلاکەکەدا هەڵدەواسن ئەو کتێبەکان لە گیرفانیان پەستێوێت، بەڵکو چەند سەرنجێکی ڕەخنەیی لە بارەیەوە بنووسن.

کە بیرم لەم ڕووداوە کردەوە شتێکی ترم یاد کەوتەوە، ڕەنگە بیسترابێت، کاتێك ژنی (شیروود ئەندرسن)ی نووسەری بەناوبانگی ئەمریکی تووشی ولیەم فۆکنەری لاو دەبێت کە بە قەڵەمی ڕەش دەنووسێت و پەڕەکانی دەستی پاڵداوەتە گالیسکەیەکی کۆنەوە، لێی دەپرسێت: "چی دەنووسیت؟" فۆکنەر بێ ئەوەی سەرهەڵبڕێت پێی دەڵێت: "ڕۆمان" ژنە بە سەرسامیەوە هاواری لێ هەڵدەستێ: "بە ڕاستتە!" دوای چەند ڕۆژێك شیر

وود ئەندرسون هەواڵ لە فۆکنەری لاو دەگێڕێتەوە کە ئەو ئامادەیە ڕۆمانەکەی بداتە بنکەیەکی بڵاوکردنەوە بۆ چاپ، بەڵام تاقە مەرجی ئەوەیە کە ناچار نەکرێت لەسەر خوێندنەوەی. ئەو کتێبە مووچەی سەرباز (Soldiers Pay) بوو کە ساڵی ١٩٢٦ بڵاوکرایەوە، -واتا دوای سێ ساڵ لە بڵاوبوونەوەی یەکەمین کتێبی بۆرخیس- فۆکنەر دوای بڵاوکردنەوەی چوار کتێبی دی ئەوسا ناوی دەرکرد و، بڵاوکەرەوەکان بێ سێ و دوو کەوتنە چاپکردنی بەرهەمەکانی. خودی فۆکنەر دەڵێت دوای ئەو پێنج کتێبەی یەکەم، ئەوسا هەستی کرد ناچارە ڕۆمانێکی ورووژێنەر بنووسێت. چونکە لە ڕۆمانەکانی پێشوویدا ئەوەندەی دەست نەکەوت خێزانەکەی پێ تێر بکات. ئەو کتێبە ناچارییەیش بریتی بوو لە حەرەم Sanctuary. ئەم کتێبە شایانی باسکردنە، چونکە بە ئاشکرا دیارە کە فۆکنەر چ بیرۆکەیەکی لە بارەی ڕۆمانی ورووژێنەرەوە هەبووە.

من ئەم ڕووداوانەم لە بارەی سەرەتای نووسەرە گەورەکانەوە کاتێك وەبیرهاتەوە کە

لەگەڵ ڕون شیبردا چوار سەعات کەوتینە هەڤ پەیڤین، شیبرد نووسەرێکی ئەدەبیی گۆڤاری "تایم"ە، لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەدەبی ئەمریکای لاتین بوو، دوو شت دڵی منیان بەو هەڤ پەیڤینە خۆش کرد. یەکەمیان ئەوەیە شیبرد بێجگە لە ئەدەب لەسەر هیچی دی قسەی لەگەڵدا نەکردم و لێی نەپرسیم، بیّ چەند و چوون ئەوەیشی لا سەلماندم کە زۆر چاك دەزانێت ئەدەب چییە.

دووەمیان ئەوە بوو هەموو بەرهەمەکانمی بە وردی خوێندبووە و بە چاکی لێی کۆڵیبوونەوە، نەك هەر کتێبێك بە تەنیا، بەڵکو بە ڕیز و تێکڕای هەموویشیان، هەروەها ئەرکی گرانی خوێندنەوەی هەندێك چاوپێکەوتنی پێشووتری منی چەشتبوو تا خۆی لەو پرسیارانە ببوێرێت کە هەمیشە بەرەو ڕووم دەکرێنەوە. ئەم خاڵەی دواییم زۆر بە لاوە گرنگ نەبوو، نەك لەبەر لەخۆبایی بوون -ئەگەرچی ئەمە بۆ نووسەرێك کە دیمانەی لەگەڵدا سازبکرێت دوور نیە، تەنانەت ئەو نووسەرانەیش کە خاکیانە دەردەکەون- بەڵکو لەبەرئەوەی کە دەرفەتی بۆ ڕەخساندم بە شێوەیەکی زۆرباش و، لە ڕوانگەی

ئەزموونەکانمەوە، دیدی تایبەتی خۆم دەربارەی پیشەی نووسین باس بکەم، هەموو نووسەریك کە دیمانەی لەگەلدا سازدەکەن -بە هۆی تیکەوتنیکی بچووکەوە- تیدەگات ئەو کەسەی چاوپیکەوتنەکەی لەگەلدا دەکات ئەو کتیبەی خویندۆتەوە کە قسەی لەسەر دەکات یان نا، هەر لەو چرکەساتەوە، رەنگە بەرانبەرەکەی پی نەزانیت، بەلام نووسەرەکە خەوشی لەسەر دادەنیت و بە چاوی سووکەوە لیی دەروانیت. من یادەوەرییەکی زۆر خۆشم لە بارەی لاویکی رۆژنامەنووسی ئیسپانییەوە هەیە. دیمانەیەکی دوور و دریژی لەسەر ژیانم سازدا و وایدەزانی من نووسەری گۆرانیی پەپوولە زەردەکانم، ئەوسا ئەو گۆرانییە زۆر باو بوو، بی ئەوەی زانیارییەکی کەمی لەسەر ئەوە هەبیت کە ئیحای ئەو مۆسیقایە لە کتیبیکەوە وەرگیراوە، منیش نووسەری ئەو کتیبەم.

شیبرد هیچ پرسیاریکی شەخسیی لی نەکردم، ریکۆردەریشی بەکارنەهینا، تەنیا لەسەر دەفتەریکی قوتابخانە جاروبار هەندێ سەرنجی

کورتی خۆی دەنووسی. هیچ بایەخی نەدایە ئەو خەلاتانەی کە پێشتر و ئێستا بە من دراون. ئەوەیشی لا مەبەست نەبوو بزانێت ڕام بەرانبەر نووسەری مولتەزیم چییە، یان چەندم لە کتێبەکانم چاپکردووە. یان چەندم لێ دەستکەوتوون. من لێرەدا پوختەی ئەو دیمانەیە باس ناکەم، چونکە هەرچییەکمان لەو چاوپێکەوتنەدا وتوە هی ئەوە نەك هی من، بەلام ناتوانم باس لە ڕووداوێك نەکەم لە ڕێڕەوی ژیانی تایبەتی مندا کاریگەریی هەبووە و ئێستا ژیانم وا نەماوە. چونکە ڕۆژانە هەر فریای ئەوە دەکەوم چەند جارێك وەلامی هەمان ئەو پرسیارە بێ تامانە بدەمەوە کە دووبارە دەبنەوە. لەوە گەنتر ئەوەیە ئەوانە هەمان ئەو پرسیارانەن ڕۆژ دوای ڕۆژ وەك پیشەی نووسەری پەیوەندییان بە منەوە نامێنێت، بەلام شیبرد، بەو سادەییەی هەناسەی دەدا، دەجوولا، بێ ئەوەی ڕووبەڕووی زەبری چ نهێنییەکی داهێنانی ئەدەبی ببێتەوە، کە ماڵئاوایی لێ کردم، تەواو تاسەی ئەو ڕۆژانەم کرد کە ژیان زۆر خاکی بوو. مرۆڤیش لە بە فیڕۆدانی

چەند سەعاتێکی کاتی خۆی تەنیا بۆ باس لە ئەدەب کردن چێژی وەردەگرت.

لەگەڵ ئەمانەیشدا، هیچ لەو شتانەی کە وتمان وەك ڕستەکەی بۆرخیس لە زەینی مندا نەچەسپی: "نووسەرانی ئەمڕۆ بیر لە سەرکەوتن و نشوستی دەکەنەوە" من ئەم قسەیەم بەهەر شێوەیەك بێت بە زۆرێك لەو نووسەرە لاوانەی دنیا وتوە کە بینیومن، بۆ خۆشبەختی من نەمدیوە هەموو هەڵپەی ئەوەیان بووبێت هەرچۆنێك بێت ڕۆمانێك بنووسن بۆئەوەی لە کاتی دیاریکراودا فریای گرەوێك بکەوێت. نائومێدیشم لێ دیون، کاتێك ڕەخنەیەکی سلبیان لێ گیراوە یان کە بنکەی بڵاوکردنەوە دەست نووسەکەیان داوەتە دواوە و بۆیان چاپ نەکردووە، ڕۆژێك ماریو بارگاس یوسام بینی دەیوت: "لەو کاتەدا کە نووسەرێك خۆی بۆ نووسین تەرخان دەکات، ئیتر گوێی لەوە نییە دەبێتە نووسەرێکی چاك یان نووسەرێکی خراپ" کەچی، چەندساڵێك، لاوێکی تەمەن بیست و سێ ساڵ کە پێش شەش مانگ ڕۆمانێکی بڵاوکردبووەوە لە مەکسیکۆ هاتەماڵەوە، ئەو

شەوەی لای من بوو هەستی به سەرکەوتن دەکرد چونکه تازه دەستنووسی ڕۆمانی دووەمی دابووە بڵاوکەرەوەیەك. من لەو پەلەکردنەی که هێشتا له سەرەتادایه سەرسامیی خۆم دەربڕی. ئەو زۆر به چاو قایمییەوە وەڵامی دامەوە که تا ئێستا له بیری ناکەم: "تۆ لەسەرت پێویسته پێش نووسین زۆر بیربکەیتەوە، چونکه هەموو دنیا چاوەڕێی نووسینی تۆیه، بەڵام من دەتوانم خێرا بنووسم، چونکه خەڵکێکی کەم دەمخوێننەوە" ئەوسا، به تەواویی له مانای قسەکەی بارگاس یوسا گەیشتم: ئەولاوە هەر له سەرەتاوە بڕیاری داوە نووسەرێکی بێ کەڵك بێت. له ڕاستیشدا وا دەرچوو، چونکه کارێکی باشی له دەزگایەکی فرۆشتنی ئۆتۆمبیلی سکرابدا دەستگیر بوو. ئیدی کاتی خۆی له نووسیندا به فیڕۆ نەدا. لەگەڵ ئەوەیشدا من ئێستا وای بیر لێ دەکەمەوە، ڕەنگه چارەنووسی بگۆڕایه ئەگەر پێش فێربوونی نووسین بیزانیایه لەسەر ئەدەب قسه بکات. چونکه لەم ڕۆژانەدا وتەیەکی باو هەیه دەڵێت: "کاری کەم و قسەی زۆرمان گەرەکە" بێگومان ئەم

قسـەیە ناپاکییـەکی گـەورەی سیاسـیە، بـەڵام بـۆ ئـەدەبیش دەشـێت. چـەند مـانگێك لەمەوبـەر بـە جۆمـی گارسیا ئیکۆسـتم وت تاقـە شـتێك کـە لـە سەرووی مۆسیقاوە بێت قسەکردنە لەسـەر خـودی مۆسـیقا، دوێنـێ شـەو، لـەوەدا بـووم هـەمان ئـەو قسەیە بۆ ئەدەبیش بکـەم، بـەڵام کەمـەکێك خـۆم گرت. **چونکە بە ڕاستی تەنیا شتێك کە لە قسـەکردنی سەر ئەدەب باشتر بێت بەرهەمهێنانی ئەدەبی چاکە.**

## چۆن ڕۆمان دەنووسریٚ ؟

بێگومـان ئەمـە یەکێکـە لـەو پرسـیارانەی گـەلێك جار بـەرەو ڕووی ڕۆماننووس دەکرێتـەوە، بـەردەوام وەڵامەکەیشـی قایل کـەرە و لەگـەڵ خاوەن پرسـیاردا دەگونجێت. بـەڵام مەسـەلەکە لـەوە قووڵـترە: وا چاکـە وەڵام بدرێتـەوە، نـەك لەبەرئـەوەی، وەك دەڵێـن، شـتی تازە تـامی خـۆی هەیـە، بـەڵکو لەبەرئەوەیـە دەشـێت لـەو ڕێگایـەوە بگەیتـە هەقیقـەت. لەبەرئـەوەیش بـە بۆچوونی من شتێك هەیـە گومـان هەڵنـەگرە، ئـەویش ئەوەیـە زۆربـەی ئەوانـەی پرسـیاری -چـۆن ڕۆمـان دەنووسرێت- لەخۆ دەکەن خودی ڕۆماننووسەکانن.
ئێمـەیش هـەموو جـارێك وەڵامـی جیـاوازی خۆمـان هەیـە، دیـارە مەبەستم لـەو نووسـەرانەیە کـە بڕوایـان بەوەیە ئەدەب هونەرێکە بۆ چاکردنی دنیا. بەڵام ئـەو نووســـەرانەی ئـــەدەب بـــە هونـــەرێك دەزانـــن بـــۆ ڕاسـتکردنەوەی ژمـارە بانکییـەکانیان، هاوکێشـەیان بـۆ نووسـین نـەك تـەنیا ڕاسـت نییـە، بـەڵکو لـەو

هاوکێشە ماتماتیکیانە دەچێت کە زۆر بە وردی ڕاڤە بکرێـت. بڵاوکـەرەوەکان ئەمـە دەزانـن. ماوەیـەك لەمەوبەر، یەکێك لـەو بڵاوکەرەوانـە بـە خۆشـییەوە باسـی ئـەو ڕێگـا ئاسـانەی بـۆ دەکـردم کـە بنکـەی بڵاوکردنەوەکـەی دەتوانێـت خـەڵاتی نیشـتمانیی ئـەدەبیی پـێ بەدەسـت بێنێـت. پێـش هـەموو شـت دەبێت شارەزای ئەندامانی لیژنەی هەڵسەنگاندنەکە بیـت، لـە بـارەی مێـژووی شەخسـی، کـار، چێژیـی ئەدەبیان. بڵاوکەرەوەکە لای وایە بەرئەنجامی زانینی ئەم توخمانـە، تـا ڕادەیـەك، لـە سـنووری دۆزینـەوەی چێـژی ئـەدەبیی لیژنەکـەی نزیـك دەکاتـەوە. هـەروەها دەڵێت: "هـەر لەبەرئەمەیشـە ژمێریـاری ئەلـەکترۆنی هاتۆتە گۆڕێ" دوای ئەوەی دەستنیشانی ئەو جۆرە کتێبەت کرد کە دەشێت خەڵاتەکە بباتەوە، دەبێت بە پێچەوانـەی ئـەوەوە کـار بکـەیت کـە لـە ژیـاندا ڕوودەدات: لـە بـری ئـەوەی بـە دوای ئـەو کتێبـەدا بگـەڕێیت کـە شـایانی خەڵاتەکەیـە، بـە دوای نووسەرێکدا دەگەڕێیت، چاك بێت یان خراپ، گرنگ ئەوەیـە لـە هـەموو زیـاتر شـارەزای هۆنینـەوە بێـت. ئەوەی دەمێنێتـەوە تـەنیا ئیمـزای سـەر گرێبەندێکـە

لەگـەڵ نووسـەرەکەدا، دانیشـێت و دەستنیشـانی تایبەتمەندییەکانی ئەو کتێبە بکات کە ساڵی ئایندە بـەرندەی خـەڵاتی نیشـتمانیی ئـەدەب دەبێـت. مەترسیەکە لەوەدایە بڵاوکەرەوە یارییەکەی داوەتـە دەسـت ئاشـی ژمێریـارە ئەلەکترۆنیەکـە، ئـەویش ڕێـژەی سـەرکەوتنی لـە سـەدا هەشـتاو حـەوتی داوەتێ.

کەواتـە مەسـەلەکە نووسـینی ڕۆمـان نییـە -یـان کورتە چیرۆک– بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە ئەوانە چەند بە جیدی نووسراون، تەنانەت ئەگەر نەفرۆشرێن یان هیچ خەڵات وەرنەگرن، ئەمە وەڵامێکە بوونی نییـە. خـۆ ئەگـە لـەم ڕۆژانـەدا یـەکێك بیـەوێت بـە دوای هۆکارەکاندا بگەڕێت، ئەوە ئەو کەسەیە کە ئەم چەند دێـرە دەنووسـێتو، لـە ناخـەوە حـەزی بـەو چارەسەرەیە کە خۆی مەبەستیەتی.

لـەم دواییانـەدا گەڕامـەوە سـەر کتێبخانەکـەی مەکسـیکۆم، نزیکـەی سـاڵێك بـوو هـەندێك کورتـە چیرۆکی تـەواو نـەکراو، ڕۆمانێك کـە دەسـتم دابـووە نووسینی و هێشتا سەری گلۆڵەکەیم نەدۆزیبووەوە، لەوێ جێهێشتبوو، لە بارەی کورتـە چیرۆکەکانەوە چ

کێشـەیەکم تـووش نـەهات! هـەموویانم خسـتنە نـاو تەنەکەی خۆڵەکـەوە. چونکـە دوای سـاڵێك دابـڕان و چـاك خوێندنـەوەیان دەتـوانم سـوێند بخـۆم -ڕەنگـە لەسەر هەقیش بم- ئەوانە چیرۆکی من نین، بەشێك بوون لـە پرۆژەیـەکی کۆن کە شەست کورتـە چـیرۆك زیاتر بوون، دەربارەی ژیـانی ئەمریکییە لاتینییـەکان لە ئەورووپادا، هـۆی سـەرەکی دڕاندنـی ئـەو چیرۆکانـە قەناعەت نەکردنم بوو پێیان.

مـن شـانازی بـەوەوە ناکـەم کـە بڵێـم لـە کـاتی دڕاندنیـاندا دەسـتم نەلـەرزیوە. پاشـانیش پارچـە دڕاوەکانم بـە جۆرێك تێکوپێك داوە کـە جـارێکی تـر پێکەوە کۆنەکرێنەوە. من لەرزێکم تێگەڕا، نـەك تـەنیا هـەردوو دەسـتم. چونکـە خـودی پرۆسـەی دڕانـدن ڕابوردوویـەکی هـاندەری لای مـن هەیـە. وەلێ پێـم ناخۆشە، سـەرەتای ئـەم یادەوەریـە دەگەڕێتـەوە بـۆ شـەوێکی حوزەیرانـی سـاڵی ١٩٥٥، کـە نوێنـەری تایبـەتی ڕۆژنامـەی "ئیسـبیکتا دۆر" بـووم بـۆ سـەفەری ئـەورووپا، کـاتێك خورخـێ گیتـانی شـاعیر هاتـە ژوورەکـەم لـە بۆگۆتـا و داوای لێکـردم نووسـینێکی بـۆ بەجێبـهێڵم تـا لـە گۆڤـاری میتـو دا

بـلاوی بکاتـەوە. مـن لـە تاقـەت کردنـی شـتەکانم ببوومەوە، ئەو بەرهەمانەی شایانی پاراستن بوون لە شـوێنێکی ئـەمیندا دامنـان، ئـەوەیش لێـی نـائومێد بووم دڕاندمن، گیتـان دوران بە نـاو پـەڕە دڕاوەکـانی ناو تەنەکەی خۆڵەکەدا کەوتە گەڕان، بە هـەمان ئەو پەرۆشییەوە کە لە ئەدەب تێر نابێت، بە تایبـەتی لـە دۆزینەوەی بەها شاراوەکاندا، لە پڕا شتێك سەرنجی ڕاکێشا، پێـی وتم: "بەلام ئەمـە بـۆ بلاوکردنـەوە زۆر چاکـە" منیـش تێمگـەیاند بـۆ دڕاندوومـە: ئـەوە فەسـڵێکی تـەواوی یەکـەم ڕۆمـانم بـوو. بـە نـاوی "زریانی گەلا"وە لێم دەرهێنابوو، ڕۆمانەکە هەر لەو ماوەیـەدا بلاوکرابـووەوە. ئـەو فەسـڵە تاقـە چارەنووسی چـاکی نـاو تەنەکـەی خـۆڵ بـوو، بـەلام گیتـان دوران سـەرنجەکەمی بەدڵ نەبوو، پێـی وابـوو دەشـێت دەق لـە ڕەوتـی ڕۆمـاندا زیـادبێت، بـەلام بەسـەربەخۆیی بەهایـەکی جیـاوازی هەیـە. منیـش خۆیـم سەرپشك کرد- نەك لەبەرئەوەی قەناعەتم بـە ڕایەکەی کردبێـت بـەڵکو تـەنیا بـۆ ڕازیکردنـی -کـە بـۆی هەیـە پـەڕە دڕاوەکـانی بـە تیـپ پێکـەوە بلکێنێتـەوە و فەسـڵەکە وەك چیرۆکێکی کـورت

بڵاوبکاتەوە. بە ڕاناوی کۆ کە کەم جار بە وردی وەك لەو حاڵەتەدا بەکاردێت لێی پرسیم: "چ ناونیشانێکی بۆ دابنێین؟" پێم گوت: "نازانم، ئەمە تەنیا مەنەلۆژێکی ئیزابیلە کە لێزمەی باران بەسەر ماکوندۆوە دەبینێت" گیتان دوران لە سەرەوەی لاپەڕەی یەکەمدا ڕستەی "مەنەلۆژی ئیزابیل کە باران بەسەر ماکوندۆوە دەبینێت"ی نووسی، بەو جۆرە لەناو تەنەکەی خۆڵەوە چیرۆکێکی کورتم گەڕایەوە کە ڕەخنەگرەکان زۆر جوانیان باس لێوە کرد و لای خوێنەرانەوە زیاتریش. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم ئەزموونە لە دڕاندنی دەستنووسەکانمی نەخستم، ئەگەر پێم وابووبێت شایانی بڵاوکردنەوە نین، بەڵکو ئەوەی فێرکردم کە وای بدڕێنم جارێکی تر پێکەوە نەلکێنرێنەوە.

لە دڕاندنی کورتە چیرۆکدا هیچ چارێك نییە، چونکە نووسینی کورتە چیرۆك لە کۆنکرێت تێکردن دەچێت. بەڵام ڕۆمان نووسین لە دانانی خشت دەکات. ئەمە بەو مانایەیە ئەگەر کورتە چیرۆك لە یەکەم هەولا سەرنەکەوت چاکترە پێی لەسەر نووسینی دانەگریت، بەڵام ئەمە بۆ ڕۆمان ئاسانترە:

چونکە دەتوانیت لە نووکەوە دەستی پیێ بکەیتەوە، ئەمە ئەوە بوو لە من ڕوویدا، نە کێش، نە شێواز، نە وێنەی کەسایەتییەکان لەگەڵ ئەو ڕۆمانەدا نەدەگونجا کە من بە نیوە ناچڵ وازم لێ هێنابوو، تەنیا لێکدانەوەیەکیش بۆ ئەم حاڵەتە هەیە: تەنانەت خۆیشم قەناعەتم پێی نەبوو، لە هەوڵی چارەکردنیدا گەڕامەوە بۆ خوێندنەوەی دوو کتێب بە بڕوای خۆم بە کەڵك بوون، یەکەمیان پەروەردە عاتیفیەکەی فلوبیر کە لە سەردەمی زۆر دووری شەوانی زانکۆوە نەمخوێندبووەوە، ئەم کتێبە تەنیا کەڵکی ئەوەی هەبوو لە لێکچوونە ناهەموارەکان خۆ ڕزگار بکەم، بەڵام گرفتەکەی منی چارەسەر نەکرد. کتێبەکەی تر کە جارێکی تر خوێندمەوە (ماڵی کچە نووستووە جوانەکان)ی **یاسوناری کاواباتا** بوو. کە پێش سێ ساڵ گیانمی هەژاند و تا ئێستایش لە کتێبە جوانەکانە. بەڵام ئەمجارە ئەویش چ سوودێکی پیێ نەگەیاندم، چونکە من بە دوای شێوازی پرۆسەی سێکسیدا دەگەڕام لای بە تەمەنەکان، ئەوەی لەم کتێبەدا بینیم ڕەفتاری ژاپۆنیە بە تەمەنەکان بوو، کە بە لای منەوە وەك خودی هەر ژاپۆنیەك شتێکی

دەگمـەن بـــوو، بیگومـــان هیـــچ پەیوەندییـــەکی بـــە رەفتـــاریی سیکســـیی تەمـــەندارەکانی ناوچـــەی کاریبیەوە نییە.

کـە لەسـەر نـانخواردن باسـی ئـەم دلەراوکییـەی خـۆم کـرد، یـەکیك لـە دوو کورەکـەم: —ئـەویان زیـاتر کردەیە— وتی: "چەند سالیك چاوەری بە تا بە هـۆی ئـەزموونی تایبـەتی خۆتـەوە لـە مەسـەلەکە بگـەیت" ئـەوی تریـان کـە هونەرمـەندە، وردتـر مەبەسـتەکەی دیاری کرد و وتی: "جاریکی دی ئازارەکانی ڤارتـەر بخوینـەرەوە" بی ئـەوەی هیچ ئاسـەواریکی گالتـە بـە دەنگییەوە دیاربیت ئەمەی پی وتم. منیش بـە قسـەم کـرد و کەوتمـــەوە خویندنـــەوەی، نـــەك لەبەرئـــەوەی بـــاوکیکی زۆر گویرایـــەلم، بـــەلکو منیـــش وام بـــیر لیکردەوە کە دەشیت ئـەو رۆمانـە بەناوبانگـەی گـۆتـە ســـوودیکم پـــی بگەیـــەنیت. وەلی ئـــەمجارەیان وەك جاری پیشوو بۆ پرسەی ڤارتەری لاو نەگریام، بەلکو نەمتوانی لە نامـەی هەشـتەم تیپـەرم، لـەو نامەیەدایـە کـە لاوە مەینـەت بارەکـە باسـی شـادمانی خـۆی لـە کۆختـە تەریکەکەدا بۆ گیلیری هـاوریی دەگیریتـەوە، هەسـتم کـرد هـەر لـە جیگـای خۆمـدام، تەنانـەت لام

سەیر نەبوو ناچاری زمان گەستنی خۆم بم تا لەو کەسانە نەپرسم کە تووشیان دێم: "برا، پێم بڵێ، ئاخ، چۆن ڕۆمان دەنووسرێت؟"

**داوای هاوکاری**

دەشێت ڕۆژێك لە ڕۆژان خوێندبێتمەوە، یان فیلمێکم بینیبێت، یان یەکێك ڕووداوێکی ڕاستەقینەی بۆ گێڕابێتمەوە کە ئەمە پوختەکەیەتی: ئەفسەرێکی دەریاوان بە دزییەوە ژنێکی دۆستی بردە کابینەی کەشتیە جەنگیەکەیەوە، لەو ژوورە تەنگەبەرەدا خۆشەویستیەکی زۆریان ئەنجامدا، بێ ئەوەی تا چەندساڵێکیش کەس پێیان بزانێت، هەرکەس دەزانێت نووسەری ئەم کورتە چیرۆکە جوانە کێیە تکای لێ دەکەم بە زووترین کات ناوەکەیم پێ بڵێت، من لە گەلێك کەسم پرسیوە و کەس نەیزانیوە، تا وام لێهاتووە گومانی ئەوە بکەم ڕۆژێك لە ڕۆژان من خۆم ئەو چیرۆکەم بە خەیاڵدا هاتووە و لە بیرم چۆتەوە، سوپاس.

## گوند

**ئەو جێگا سامناکەی، مریشکەکانی هێور دێن و دەچن**

لە راپرسیەکدا، کە بەم دواییە لەگەڵ ئەو منداڵانەدا کراوە لە شارە گەورەکانی ئەوروپادا دەژین، ناوی ئەو کەسەیان لەو منداڵانە پرسیوە کە نامە دەگەیەنێتە ماڵان، ئەو کەسەی شیر دێنێتو ئەوەیش کە رۆژنامە و نان دەگەیەنێت، ئەو کەسەیش کە پیسی کۆدەکاتەوە و ئەوەیش کارەبا و ئاو چاك دەکات. هەموو منداڵەکان یەك وەڵامیان دابووەوە: دەرگاوان ئەو کارانە دەکات.

ئەو منداڵانە هەر دەبوو وەڵامێکی وا بدەنەوە، چونکە لەو مۆڵگا شارییە گەورانەدا، کە چرۆکردنی گوڵێك لە موجیزەی دروستبوونی گەردوون دەچێت، کە بتەوێت بچیتە ئاپارتمانێك دەبێت بە ناچاری بە بەردەم یەکێکدا تێپەڕیت کە فەرمانێکی خودایی پێیە، ئەویش دەرگاوانە.

که به منداڵی سروشتیان پێ ناساندین و، له ڕاستیا سروشتیش ئەو شتانه بوون له گوندا دەورەیان دابووین، ئێستا له تەلەفزیوندا یەکێکه له بەرنامه ئەفسوناویەکان. کەواته منداڵێك که له قاتی شانزەهەمی ئاپارتمانێکدا دەژی و، چوونه دەرەوەی له ماڵ تەنیا له ماشێنێکدایه بۆ قوتابخانه و، مۆڵەتی زستانەی له هەوارێکی بەفریندا بەسەر دەبات و هاوینەکەیشی له کەنار دەریایەکی ئاپووڕەدایه، هەقی خۆیەتی ئەو پیاوه نەناسێت که له کۆندا جلێکی شینی لەبەر دەکردو، به سواری پایسکلێك نامەی به خاوەنەکانیان دەگەیاند، هەروەها ئەو پیاوه بەرگ سپیەیش نەناسێت که نەك تەنیا شیری دەگەیانده ماڵان، بەڵکو ئەوەنده دەربەستی کاتەکەی بوو که وەك سەعات کەڵکی وەختی لێ دەبینرا، هەموو ئەم کەسانه وەك بەشێك له ئەندامانی خێزانیان لێدەهات، سەربەستانه خۆیان به چێشتخانەدا دەکرد بۆ قاوەخواردنەوه و، لەگەڵ بەردەستەکاندا له ڕاز و نیازی دراوسێکان دەدوان، تا وای لێدەهات له نیوەڕۆژەیەکدا و زۆر به سانایی گوێ بۆ یەکێك شل بکەین که دەڵێت: "بیترا

لە پۆستەچیەکە ئاوسە" تەنیا سادەییەکیش کە ئێمەی منداڵی ئەو سەردەمە بە خۆمان ڕادەبینی، ئەو بڕوایە بوو کە ئەو منداڵەی بیترا دەیبێت بێجگە لە پۆستەچییەکی بچووك نابێت چیتر بێت.

باهۆزی شارستانیەت توانی لە ئیسپانیادا ڕەگی یەکێك لە دیارترین کەسایەتی ژیان و ئەدەبی ئەو وڵاتە دەربکێشێت، مەبەستم پاسەوانەکانی شەوە، تا ئێستایش هەندێك لەو پیرە خانەنشینانە ماون کە هەموو نهێنییەکی شەقامەکانیان دەزانن، چونکە بێ ئاگاداریی ئەوان هیچ ڕووی نەدەدا. پاسەوانی شەو بەرپرسیاری ئاشتی و ئاسوودەیی ناوچەکەی بوو، ڕستێك کلیلی هەموو ماڵەکانی لابوو، ئەوانەی شەوانە درەنگ دەگەڕانەوە کلیلیان هەڵنەدەگرت، پاسەوانەکان دەرگاکانیان بۆ دەکردنەوە، هەمیشە ئەو پاسەوانانە لەبەردەستا بوون، ئەوەندە بەس بوو دووکانی سەرکۆڵانەکەیان بۆ بگەڕێیت، لەگەڵ پاسەوانەکانی تری گەڕەکدا شەویان بە دەم قسەوە بەسەر دەبرد، یان ئەوە بەس بوو کە چەپڵەیەك لێ بدەیت و ئەو زوو لەبەردەمتا قوت بێتەوە. من دەپرسم، ئەگەر ئەمڕۆ یەکێك

چیرۆکی ئەو پاسەوانە بەڕێزانە بۆ منداڵی شارە گەورەکانی ئیسپانیا بگێڕێتەوە کە چۆن شەوانە دەرگایان بۆ دەکردینەوە، ئایا ئەو منداڵانە چییان بە بیردا دێت. بێگومان بڕوا ناکەن، هەروەها کە پیریش بوون هەست بە یادەوەری ئەو چەرخە ناکەن کە چەقۆ و مقەستی تیژ دەکرد و، وەك خۆرگیران، لە کاتی خۆیدا دەهاتە نێو گەڕەکەوە و، کۆڵانەکەی پڕ دەکرد لە هەرا و زەنا و بۆن و بەرامەی خۆی.

لە نێوان هەموو ئەو کەسایەتیانەی منداڵیی ئێمەدا، کە منداڵانی ئێستا زۆر کەمتر بە خۆیان و سیمایان شارەزان، ئەو تاقە کەسە بوو کە ناوبانگی بە پێوقەدەم ڕەش دەرکردبوو، ئەو کەسەی بروسکەی دەهێنا، ڕەنگە هەر خودی پەیامهێنەرەکان دەوریان بووبێت لە دروستکردنی ئەو وێنە بەدەی ناویان پێ دەرکردبوو، چونکە زۆر بە پەلە دەرگایان دەکوتی، شاوڕێکیان لێدەدا وەك ئەوەی شووتی ڕووداوێکی کتوپڕ بێت، پاشان هاواریان دەکرد "بروسکە". زۆر پێش ئەو سەردەمە، کە هەموو دنیا موڵکی ئێمە بوو، ئەو

جـۆرە ئاگاداركردنەوەيـە تـەنيا لـە سەرشـانى ئەستێرەناسـان بـوو. بـەلأم كارمـەندانى تـەلگراف، هـەر لـە دروسـتبوونى ئـەم ئـامێرەوە، بـوون بـە پەيامبەرى مەرگ. هەر پێش ئەوەى يەكێك فرياى ئەوە بكەوێت دەرگايان لێ بكاتەوە، دەبوو دەست لە ژێربـالّى نەنكـە بووراوەكـە وەردەن، لەگـەلّ گەيشتنياندا سەگەل دەكەوتە وەڕين، مريشكەكان بەو ڕۆژى نيوەڕۆيە، بە هۆى كارەساتەكەوە سەرى كاتيان لێ تێك دەچوو و، خۆيان لە كولانەكانيان دەخزاند و كڕ دەبوون، ئەوەمان كە بروسكەكەى وەردەگرت لە دەم و چاوى پەيامهێنەكە ڕادەما، چونكـە دەيزانـى ئـەو نـاوەڕۆكى بروسـكە مەينەتبارەكەمان دەزانێت، بە نووزەيەك سوپاسمان لێ دەكرد و دلّمان لە دەرپەڕيندا بوو، لە ناخەوە داخمان بۆ داب و نەريتى سەدەكانى ناوەڕاست دەخواست كە هەركەسێك هەوالّێكى ناخۆشى بگەياندايە لە داريان دەدا. وردە وردە، ئەو ترسە لەو بروسكانە ڕەوييەوە، چونكە درەنگ دەگەيشتن و ببووە شوێنى گالّتەپێكردن.

پیاوێك كە ویستبووی سەفەر بۆ لای خۆشەویستەكەی بكات پێشتر ئەم بروسكەیەی بۆ ناردبوو: "كاتێك ئەم بروسكەیەت بە دەست دەگات كە من لە ئامێزتام"

تەنانەت پزیشكی خێزانیش، كە تەنیا هاتنی بۆ ماڵەوە بەس بوو بۆئەوەی پلەی گەرما بێنێتە خوارێ، ئێستا لەو شارانەدا خودایەتییەكی نادیاریان بۆ خۆ پەیداكردووەو دڵیان بۆ ئێمە لێنادات، پێش ماوەیەكی كەم یەكێكیان بۆی گێڕامەوە نەخۆشێك لە حاڵەتێكی پڕ لە مەترسیدا بووە، پزیشكەكان بە پێی پسپۆڕیان شەش جۆر شیكردنەوەی جۆراوجۆریان بۆ نووسیوە. كەچی نەخۆشەكە هەر لە هەمان شەودا مردووە. پاش بیست و چوار سەعات، دوای ناشتنی، لە شیكردنەوەكاندا دەركەوتووە باری تەندروستی نەخۆشەكە زۆر چاكە.

ئەم ڕووداوە تۆقێنەرانەی شارستانیەت بەرهەمی هێناوە و بە داخەوە وەك گاڵتەیەكی كاریگەر باسی لێوە دەكرێت، تەنیا لە دنیایەكدا دەتوانیت لێی تێبگەیت كە منداڵان لە باوكیان

بپرسن ئایا مانگا هێلکە دەکات، یان ماکەرۆنە لەسەر درەخت پێدەگات.

تەلەفزیۆن چارەسەری ئەم گومانەی بۆ نەکراوە، بۆیە قوتابخانەکانی فەرەنسا قوتابییەکانیان ناچار کردووە لەسەر دەورەیەکی تایبەتی کە بۆ ماوەی مانگێك لە گوندا بژین، لە هەوای ئازاد و بە دووچاوی کراوەوە، بۆئەوەی نیوەکەی تری ئەو دنیایە ببینن کە نیوە شارستانیەکەی بەری لێگرتوون. من وای بۆ دەچم، ئەوەی کاتی خۆی ئێمەی منداڵانی گوند کە بۆ یەکەمین جار بردیانینە شار بە سەرمان هات ئەمانیش هەروایان لێدێت. چۆن کە ئێمە سینەمامان بینی تەواو سەرسام بووین، ئەوانیش لە هێلکەکردنی مریشکێکا هەروایان بەسەر دێت. کە لە ڕێگادا دوو سەگی لکاو دەبینن تووشی هەمان هەڵچوونی ئێمە دێن کە پیاوانی ئاگرکوژاندنەوەمان لە کاتی کوژاندنەوەی ئاگردا بینی، کە بە گۆشت و ئێسکی ڕاستەقینەوە گوێدرێژ دەبینن چۆن دەڕوات و دەزەڕێت، ئەوانیش موویەك لە کلکی دەکەنەوە، هەمان

مەترسی ئێمەیە بۆ بینینی یەکەمین فڕۆکە لە کاتی نیشتنەوەیدا.

هاوڕێم ئەلیخاندرۆ سانتسو روبینو، کە چل و دوو ساڵ لەو گەورەترم، بۆ شارەزابوونی سروشت لە خۆرهەلاتی فەرەنسادا خولێکی تەواو کرد، بە سەرسامییەوە باسی ئەزموونی خۆی بۆ کردم وەك چۆن دەریاوانە کۆنەکان باسیان لە سەفەرەکانیان دەکرد. وەلێ چیرۆکەکەی، لە دووری دە هەزار کیلۆمەتری ولاتە هاوبەشەکەمانەوە، ئەوەی فێرکردم ئێمە چەندە لە زەمانیشدا لەم ولاتەوە دووریـن. تیپەکەی ئەلیخاندرۆیان بردبوو داربڕینیان پیشان بدەن. بەلام داربڕەکە لەوانە نەبوو وەك چۆلەکەی دارکونکەرە ڕۆژێکی تەواو بۆئەوە تەرخان بکات بە تەور قەدی دارەکە ببڕێتەوە، بەڵکو دارەکەی بە مشاری کارەبایی و بە شێوەیەکی زانستیی ورد بڕیبووەوە، هەروەها تەماشای مانگا دۆشینیان کردبوو، بەلام نەك بەدەست، وەك من لە لوس سیتی و کولیناس دی کولوریس، ببویکادا بینیومە. بەڵکو بە هۆی ئامێرێکی کارەبایی شیردۆشینەوە کە ڕاستەوخۆ

دەفری شیرەکان دەباتە ژووری کولاندنەوە. مانای وایە لە وڵاتە پیشەسازییەکاندا هەرگیز شوێنێکت دەست ناکەوێت منداڵ بتوانێت وێنایەکی ڕاستەقینە بۆ گەوجایەتی دواکەوتن بکات کە جوانیشە و غەم ئەنگێزیش.

وەڵێ دوو کوڕەکەم. وەك چرکەساتێکی دەگمەنی ژیانیان، ئەو سەر لە ئێوارەیە لەبیر ناکەن کە چووبوونە گوندێکی کاریبی بۆ دیدەنیی نەنك و باپیریان، لەوێ بۆ یەکەمین جار بۆقێکی زیندوویان بینیبوو، ئەوەندەیان پێ سەیر بوو تا ئەو ڕادەیەی قتوویەك بۆیە و فڵچەیەکیان پەیدا کردبوو، هەرچی بۆقی نێو گوندەکە هەیە بە ڕەنگی زەرد بۆیەیان کردبوون.

## بیجی، ماچێکم بدەرێ

ئـەو بەیانیـە، پـەیامێکی گـەورە لەسـەر دیـوارە سپییە درێژەکەی بەرانبـەر بە ماڵەکەی مەکسیکۆم بەم جۆرە نووسرابوو: "بیجی، ماچێکم بدەرێ" بـە پـەمپێکی بۆیـەی وایـش نووسرا بوو مەرەکەبەکەی نەدەکوژایـەوە، لەو جۆرە بۆیانـەی لـە شـەڕی سـەر دیـواری سیاسـیدا بـەکاردێت، لـە هـەندێك شـوێندا بۆیەکە خەست و لـە شـوێنی تـردا کـەم گرتبـووی، وەك ئەو پەیامە نهێنیانەی لە بێدەنگیی بـەیانیاندا بە هەناسەیەکی کپەوە دەنووسرێن و، هاوڕێکانیان لەم سەر و ئەوسەری شەقامەکەوە چاوەچاویانـە و لـە کاتی پێویستا بـە ئاگایـان دێنن. وەلێ پەیامەکە دوور لـە ناوچـەی ئـاوەدانی و سـاختمان بـوو کـە زیاتر لەو شوێنانەدا ئەو شەڕی تارماییانە دەکرێن، تەنانەت کرانەوە ئەخلاقیەکە ناگاتە شارە زانکۆییـە نزیکەکان. بەڵام پەیامەکە لەوە گەورەتر نووسرابوو

که بیجی کاتێك بەوێدا تێدەپەڕێت نەیبینێت. ئیدی چەندە بیجی خۆی لێ گێل بکات یان گوێی نەداتێ، پەیامەکە لەوە خەمۆکتر بوو دڵە ڕەقەکەی ئەو بپێکێت.

کاتێك پەیامەکەم بینی تازە لە خوێندنەوەی ڕۆژنامەکان ببوومەوە. ئەو ڕۆژنامانەی خوێندنەوەیان لەم ڕۆژانەدا لە خواردنی شووشەیەك ڕۆن گەرچەك دەچێت بە دڵی ناشتا. من کە بەیانیان لە خەو هەڵدەستم، وا ڕاهاتووم لە ڕێگای خوێندنەوەی ڕۆژنامەوە دیدێکی پانۆرامایی لەسەر دنیا دروست بکەم، هەستم کرد لە هەموو شتێکدا یادەوەریەکی تاڵ هەیە. لە هەموو جێگایەکدا، نەك تەنیا لە خۆمدا وەك ئەوەی خوان تینوریو لە سەردەمانێکی سەقامگیرتردا وابوو، بۆیە هەستم بە بۆنی مەرگ کرد کاتێك زانیم یەکێکی زۆر نزیك لە ماڵەکەمەوە، لەم دنیایەدا هیچ کێشەیەکی نییە بێجگە لەوەی کە بیجی ماچێکی بداتێ.

ماوەیەك لەمەوبەر ڕۆژنامەی ئیسبریسوی ئیتالی وتارێکی بڵاوکردەوە گریمانەی ئەوە دەکات کە

مۆدێلی سێکس بەرەو لەناوچوون دەچێت و، خۆشەویستی لەسەر شێوەی کۆن جارێکی دی بە شکۆمەندییەکەیەوە لە بڵاوبوونەوەدایە. ڕۆژنامەکە لە ڕێی ڕاپرسییەکەوە گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی زۆرێك ژن و پیاو هەن پرۆسەی سێکسیان لا کەم بۆتەوە، تەنانەت ژن و مێرد هەن لەگەڵ ئەوەیشدا بە تەواوی لە کاری سێکسی وەستاون کەچی زۆر بەختەوەرن. وازهێنان لەو شەیداییەی جاران بۆ سیکس دەگێرنەوە بۆ ساڵانی شەستەکان کە پیدەچیت مرۆڤایەتی هەموو ئارەزوە یەدەگەکانی لەدەست دابیت. ئاماریش بۆ سەلماندنی ئەمە هەیە. چونکە سی لە سەدی کچان و، پەنجا و پینج لە سەدی کوران، پیش ئەوەی تەمەنیان بگاتە پانزە سالی، لە سالەکانی شەستا ئەزموونی سیکسیان هەبووە، بەڵام لە کۆتایی ئەو دەیەدا بەپیی دانپیانانی خۆیان، چوار لە سەدی کچان و سیانزە لە سەدی کوران لە تەمەنی پانزە سالیدا کەوتوونەتە ئەو ئەزموونەوە.

لەگەل ئەمانەیشدا من وای بۆ ناچم ئەو سەرژمیریانە بەلگەی ماندووبوونی ئیمە بن لە

سێکس، بەڵکو بۆ سەلماندنی ئەوەیە ئێمە ئەوەندە لە ژیانمان بە سێکس دەبەخشین کە بە ڕاستیی شایانیەتی، ئەو توخمانەیش لە خۆشەویستیمان سەندۆتەوە جارێکی تر پێی دەبەخشینەوە. من بە درێژایی تەمەنی خۆم پرۆسەی ئازادی سێکسم لە دوو وڵاتدا بینیوە کە جێگای بڕواکردن نەبووە، ئەو دوو وڵاتەیش کۆلۆمبیا و ئیسپانیان.

لە ئیسپانیادا، کە بە قەد ماڵەکەی بەرناردا ئەلبا فراوان و، لە کانتربریەوە تا دەریای ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە، گوشاری تۆقێنەری کۆمەڵایەتی زۆر لە پێش مردنی جەنراڵ فرانکۆوە دژی پشتێنی داوێن پاکی باڵادەست بووە. پێش نزیکەی پانزە ساڵ، کاتێك پێویستیی لە ئاکار بەهێزتر و، دەرگای وڵاتانی ئەوروپا بۆ گەشتکردن لەسەر پشت بوون. پیاوانی پاسەوانی ئەهلی لەسەر کەنارەکانی دەریا، بە دوای ئەو فریشتانەدا دەگەڕان کە لە بەفری باکوور هەڵاتبوون و بێجگە لە مایۆیەکی بەکینی هیچیان لەبەردا نەبوو، دایکانی خێزانی خانەدان کە لە پەنجەرەی ماڵەکانیانەوە ئەو فریشتانەیان دەبینی بە بێزاریەوە ناڕەزایی خۆیان دەردەبڕی و

پێیان دەوتن "سۆزانیەکان". لە ئوتێلەکاندا، تەنانەت لە نوێترین و گرانترینیاندا، سەردانی ژوورەکان قەدەغە بوو. خۆ ئەگەر میوانەکە لە هەمان ڕەگەز بوایە قەدەغە کردنەکە زۆر بە زێدەڕۆییەوە بەجێ دەهێنرا. ئەگەر تاقە ئاماژەیەك هەبێت بۆ گۆڕان لە کۆمەڵگای هەمان سەدەکانی ناوەڕاستدا، تەنیا داخستنی ئوتێلە هەرە دیارەکەی شارە لەبەرئەوەی کەس نەدەچوو تیایدا بخەوێت، مەبەستم لە ئوتێلی بیدرالیسەیە کە کۆشکێکی کۆنە، لەو کۆشکەدا ژوورێکی چینی هەیە هەموو شتەکانیناوی وا دێنە بەرچاو لە چیندا بێت. ژوورێکی فارسیشی تیایە شتەکانی ناوی وا دەردەخەن لە وڵاتی فارسدا بێت. پەردەکانی لە مەخمەڵ بوون وەك پەردەی هەموو سۆزانیخانەکانی دنیا، ئاوێنەکانی بن میچ باڵانوێن بوون. ڕەنگە بۆئەوە بێت لە کرێگرتەکان بگەیەنن ئەوەی بۆیان دەکەن زۆر لەو پارەیە زیاترە لێیان وەردەگرن. خۆشترین شت بۆ دوو کوڕەکەم کە ئەوسا لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی پاڵ ئەو بەهەشتە نهێنییەدا بوون، ئەوە بوو لە کاتی پشووی نێوان

وانەکاندا بە دیوارەکاندا هەڵدەگەڕان و تەماشای ئەوێیان دەکرد. خۆشترین شت ئەوە بوو پاسەوانانی کۆشکەکە بە پەلە ژمارەی ئەو ماشێنانەیان دادەپۆشی کە دەچوونە ناوەوە، بۆئەوەی ئەوانی تر خاوەنەکەی نەناسن، بە خەیاڵ پلاوی خۆیان نەهێنیان لەو شارە بچووکە دەشاردەوە کە خۆی حەزی لە واتەوات بوو، چونکە لەو شارەدا هەواڵی کارەساتەکان پێش ڕودانیان بڵاودەبووەوە. هەموو ئەم شتانە بۆ گۆتای چلەکانم بیردێنێتەوە. کاتێك بۆ یەکەمجار لە کەناری کاریبیەوە هاتمە ئەو شارە، تەمەنم سیانزە ساڵ و سادە بووم، وەك وڵاتە پاکەکەم. دایکم، وەك هەر دایکێکی دی، لە دوو مەترسیی گەورەی دەپاراستم ئەو کاتە بڵاوبوون: یەکەم نەخۆشی هەوکردنی سی، دووەم بەزۆر ژنهێنان. لە ڕاستیا ئێمەی کاریبییەکان (نەك کاریبینیەکان، وەك ئێستا پێمان دەڵێن و نایشزانم ئەمە لە کوێوە هاتووە) کە ڕاهاتووین لەسەر خۆ ڕووتکردنەوە لە هەر جێگایەکدا بێت، چونکە پلەی گەرما لە سێبەردا سی پلەی سەدیە، لەبەردەم بەزەیی ڕەشەبای

ئەندیزدا دەژیاین و، گەلێکمان بە شێوەیەکی زۆر کتوپڕ و ناخۆش بە نەخۆشی هەوکردنی سی دەمردین، تەواو وەك ئەو گەشتیارە بۆگۆتیانەی لە دەریادا دەخنکان، بۆیە هەمیشە ئامۆژگاری ئەوەیان دەکردین لە ژووری داخراودا خۆمان ڕووت بکەینەوە و، لە کاتی هاتنە دەرەوەی سینەمایشدا دەستەسڕێك بە دەممانەوە بگرین، تا ئێستایش ئەمە هەر لە بۆگۆتادا باوە، نایشزانم چ بنەمایەکی زانستی هەیە.

مەترسی دووەم/ هاوسەریەتی بەزۆر بوو، لە ڕاستیا ئێمە هەر لە منداڵییەوە لەسەر ئەوە ڕاهاتبووین بچینە ماڵی خەڵکی تر، یان پوورەکانمان بێنە ماڵمان، ئێمەی کوڕانی کەنار دەریا لە بۆگۆتا، ئەو باوەڕەمان هەر تیامابوو ئەگەر ئەو کارەیش بکەین سزا نادرێین، بۆیە زۆرجار کە دووگیانمان دەبینی دەشڵەژاین.

بێگومان ئەوە لە هەموو مەترسیەکانی دی چاکتر بوو، چونکە ئەوسا نەخۆشی فەرەنگی بڵاو بوو، لەناو هەموو ماشێن و ئاودەستە گشتیەکان و، لە هەموو جێگایەکدا ئاگاداریان دەکردینەوە:

"ئەگەر لە خوایش ناترسین با لە فەرەنگی بترسین" تاقە رێگای رزگاربوون لە تەنیایی ئاهەنگی سەمای رۆژانی شەممە بوو، ئەویش بە دوو بیزۆ. لەوێدا بە چاکی تاقە لایەنە حەڵاڵەکەی خۆشەویستیمان دەبینی: سەمای ئەلبولیر، پاشان ژوانی دوای نوێژی رۆژی داهاتوو، نامە بۆنخۆشەکان، هۆڵە ناچاریەکانی سینەما، فرمێسکی سەر سەرینە خاڵیەکان- شیعریش.

هەموو ئەمانە لە شەستەکاندا تێپەڕین، رەشەبای سێکسی رووت هەمووی راماڵین، من ئەمەم بەلاوە خراپ نەبوو، بە پێچەوانەوە، بەڵام وا چاکترە سێکسیش شان بە شانی هەموو شتەکانی تر بێت، تا خۆشەویستییەکی تەواو کامڵ دروست بێت. بێگومان هەر ئەوەیشە ئێستا بەرێوەیە، بەپێی ئەو ئاماژانەی دڵ دەیاندات. ئەو رۆمانانەی باس لە خۆشەویستی دەکەن جارێکی دی لە زۆرفرۆشیدا ریزی پێشەوەیان گرتەوە، عاشقەکان لەسەر شەقامەکاندا کەوتنەوە ماچ و موچ، چەند رۆژێك پێش ئێستا، کوڕە تەمەن هەژدەساڵەکەم داوای لە دایکی کرد فێری سەمای ئەلبولیری بکات،

چونکە خەریکە مۆدەکەی دەگەڕێتەوە، چ وەك سەما و چ وەك گۆرانی، بۆ زیندوکردنەوەی ئەم جۆرە سەمایە لە ئەمریکا و ئیسپانیادا هۆڵی تاریکیی تازە دەکەنەوە.

من هەمیشە بڕوام وابووە خۆشەویستی دەتوانێت مرۆڤایەتی لە مەترسیی لەناوچوون رزگار بکات. ئەو نیشانانەی وا دەردەکەون گەڕانەوە بن بۆ دواوە، لە راستیدا تەواو بە پێچەوانەوە چرای ئومێدن. بۆیە زۆر بە تاسەوە هیواداری ئەوەم بیجی ئەو پەیامە بخوێنێتەوە کە کوڕێك بەرانبەر بەماڵەکەمان نووسیویەتی:

**بیجی، تکات لێ دەکەم، ماچێکی بدەرێ**

## منەکەی تر

چەند ڕۆژێك لەمەوبەر، کە لە مەکسیکو لەناو جێگاکەم هەستام، لە ڕۆژنامەیەکدا هەواڵێکم خوێندەوە، گوایا من ڕۆژێك لەوەوبەر وتاربێژیەکی ئەدەبیم لە شاری بالمادیگران کاناریا (لە دوورگەکانی کەناری، لەبەری ئەوبەری ئۆقیانووسەوە) پێشکەش کردووە، هەواڵنێرە وردەکارەکەی ڕۆژنامە تەنیا بەوە دانەکەوتبوو هەواڵەکە بە درێژی بگەیەنێت، بەڵکو پوختەیەکی هێمابەخشی وتاربێژیەکەیشمی باسکردبوو. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام بابەتەکە زۆر لەوە زیرەکانەتر خرابووە ڕوو کە بە خەیاڵی مندابێت، شێوازی پێشکەشکردنەکەیش لە سەرووی توانای منەوە بوو، بەڵام تەنیا تاقە خەوشێکی هەبوو: من نە چووبوومە شاری بالما، نە دوێنێ و نە لە ماوەی بیست و دوو ساڵی ڕابوردوودا، هەروەها لە هەموو

تەمەنما و لە هیچ شوێنێکی ئەم دنیایەدا وتاربێژیم لەسەر هیچ بابەتێك نەکردوە.

گەلێك جار بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە من لە فلانـە جێگـا ئامـادە بـووم و لـەوێیش نـەبووم، ئەگەرچی چەند توانیبێتم ئەوەم ڕاگەیاندووە من بەشـداری لـە ئاهـەنگی گشـتیا ناکـەم و بـەرگی مامۆسـتایانی زانکـۆ ناپۆشـم و لـە تەلـەفزیۆندا دەرناکـەوم، بەشـداری لـە پرۆپاگـەندەکردندا بـۆ فرۆشـتنی کتێبـەکانم ناکـەم و نابمـە نمایشـکەری هیـچ پێشدەسـتییەکیش. ئـەم خـۆ تـەریك گرتنـەم لەبەرئەوە نییە خاکیم، لەبەر هۆیەکی لەوە خراپترە: ئەویش شەرمنیە. ئەمە چ کێشـەیەکم بـۆ دروسـت ناکات، چونکە گرنگترین شت کە لـە مـاوەی چـل سـاڵی ڕابـووردوودا فـێری بـووبم ئەوەیـە بڵێـم نـا، ئـەویش ئـەو کاتـەی کـە پێویسـت بکـات بڵێـم نـا، لەگـەڵ ئەوەیشـدا، کەسـانێك هـەن حـەزیان لـە وروژاندنە، لە ڕۆژنامە و داوەتی تایبـەتیدا بـڵاوی دەکەنـەوە کـە سـەعات چـواری ئێـوارەی چوارشەممەی داهاتوو ئامادەی ئاهەنگێك دەبم، من خۆم ئاگام لەو ئاهەنگە نییە، هەر لەو سەعاتەدا،

ئەوەی حەزی لەم وروژاندنەیە باس لەوە دەکات  کە نووسەرەکە لە بەڵێنەکەی پەشیمان بۆتەوە و نەهاتووە بۆ ئاهەنگەکە. چەند دڵۆپێک ژەهریش دەکات بەسەر ئەوەی کرێکارانی تەلگرافدا کە بە هۆی ناوبانگیانەوە لە خۆیان بایی بوون، سۆزی خەڵکەکە دەجولێنێت  بۆئەوەی چی بە دەمیا دێت بیڵێت.

لە سەرەتای ژیانی هونەرمەندیمدا، ئەم فێڵە قێزەونە جەرگی ئاودەدام، بەڵام کە دوا بەشی یاداشتە خۆشەکەی گراهام گرینم خوێندەوە کە ئەویش لەسەر  هەمان مەبەست هاواری لێهەستاوە منیش ئاهێکم پیاهاتەوە. لەوێوە تێگەیشتم کێشەکە چاری نییە و، خەتای  کەسیشی تیا نییە، چونکە منێکی تر هەیە بە سەربەستی بە دنیادا دەگەرێت، بێئەوەی چ سانسۆرێکی لەسەر بێت، هەموو ئەو کارانەیش کە پێویستە بکرێت و ئێمە پێی ناوێرین ئەو دەیکات.

لەم بارەیەوە وتاربێژیە دەست  هەڵبەستراوەکەی شاری بالمای دورگەکانی  کەناری لە رووداوە هەرە سەیر و سەمەرەکان نەبوو، بەڵکو ئەو رووداوە

شوومە کە پێش چەند ساڵێك لەگەڵ کۆمپانیای ئێرفرانس لەسەر نامەیەك بەسەرم هات کە هەرگیز نەمنوسیبوو. زۆر لەوە سەیرتر بوو، کۆمپانیای ئێرفرانس ناڕەزاییەکی توندی بە ئیمزای منەوە پێگەیشتبوو. من لەوێدا سکاڵا لەو مامەڵە خراپە دەکەم کە لە گەشتی ئاسایی نێوان مەدرید و پاریسدا قوربانیەکەی من بووم. لە ڕۆژێکی دیاریکراودا، دوای لێکۆڵینەوەیەکی کوك و پتەو، کۆمپانیاکە سەرکۆنەی کچە میواندارەکەی کرد کە پەیوەندی بەم مەسەلەیەوە هەیە، بەڕێوەبەرێتی گشتی پەیوەندییەکان نامەیەکی پۆزش هێنانەوەی فرە بەڕێز و پەشیمانی دەربڕینی بۆ ناردم، من سەرم سوڕما، چونکە هەرگیز ئەو سەفەرەم نەکردبوو، لەوە زیاتریش: من لە سواربوونی فڕۆکە دەترسم، بۆیە ئاگام لەوە دەبڕێت چۆن مامەڵەم لەگەڵدا دەکەن، هەموو توانام دەخەمە سەر گرتنی کورسیەکەی ژێرم تا یارمەتی فڕۆکەکە بدەم هەر بە ئاسمانەوە بمێنێتەوە، یان ناهێڵم منداڵان بە ڕاڕەوە تەختەکاندا ڕابکەن نەك زەمینەی فڕۆکەکە کون بێت. تاقە ڕووداوێکی ناخۆشی ناو فڕۆکە لە

رێگـــای نیویۆرکـــدا تووشـــی هـــاتم، فڕۆکەکـــە سەرنشینی زۆر و هەناسـەی بەتـەنگ دەهێنـا. لـەو سەفەرەدا، کچە میواندارەکە گوڵێکی سووری دایـە هەریەکێك لە سەرنشینەکان، من لە تاو ترسی خۆم دڵم بۆ کردەوە و پێم وت: "لـەباتی ئـەوەی گوڵمان بدەنـێ، چاکـترە پێنـج سـانتیمەتر بۆشـاییمان بـۆ دەسـتەبەر بکـەن تـا قاچمـان بحەسـێتەوە" کچۆڵـە جوانەکـە، کـە لـە نـەژادی داگیرکـەرە توندخوەکـان بوو، زۆر بە لاساری وەڵامی دامەوە: "ئەگەر ئەمەت پێخۆش نییە فەرموو دابـەزە" مـن هیـچ ئـەوەم بـە بیردا نـەهات ناڕەزایی بدەمە ئـەو کۆمپانیایـەی تـا ئێستایش نامـەوێت ناوەکەیم بیربکەوێتـەوە، بـەڵکو لەسـەرخۆ دەسـتم کـرد بـە خواردنـی گوڵەکـە، گـەڵا گەڵایم جاوی بە بۆنە خۆشەکەیەوە کە تەندروستە و تـرس و دوودڵـی ڕەوێنـە، تـا هاتمـەوە سـەرخۆم. بـــەمجۆرە، کـــە نامەیـــەکم لـــە کۆمپانیایـــەکی فەرەنسییەوە پێگەیشـت تـەریق بوومـەوە، چونکـە بـاس لـە کـارێك دەکـات مـن نـەمکردووە، بۆیـە بـۆ ڕوونکردنـــــەوەی مەســـــەلەکە چوومـــــە نووسـینگەکانیان، لـەوێ نامـــەی ناڕەزاییەکـــەیان

پیشـاندام، نـەمتوانی نکوڵـی لێ بکـەم، نــەك تــەنیا لەبـەر شـێوازی نووسـینەکە، بـەڵکو لەبەرئــەوەیش زۆرم لەسەر دەکەوت تا ئەوە بسـەلمێنم کە ئیمـزای من نییە و ساختەیە.

بێگومان ئەوەی ئەو نامەیەی نووسیوە هەر ئەو کەسەیە لە دوورگەکانی کەناریدا وتاربێژی کردووە، هـەر ئەویشــە گــەلێك کـاری تــر دەکـات مەگــەر بــە رێکـەوت پێـی بـزانم. زۆر جـار، کـە دەچـم بـۆ مـاڵی هاورێیـــەکم، بـــە بیـــانووی خۆخـــەریکردن لـــە کتێبخانەکەیدا بە دوای کتێبەکانی خۆمدا دەگەڕێم، بێئـەوەی پێـبزانن وەك دیـاری خـۆم لـە سـەریان بـۆ دەنووسـم، بـەڵام زیـاد لــە دوو جــار، ئــەو کتێبــە پێشکەش کراوانەم دیوە کە بە خەتی خۆم، بە هەمان ئەو مەرەکەبەی بـەردەوام پێـی دەنووسـم، هـەر بـەو شێوازە خێرایە و، بەو ئیمزایـەی کـە کـەم و زیـادی لەگەڵ ئیمزای خۆمدا نییە لەسەریان نووسراوە. هەر بە رێکەوتیش چاوپێکەوتنی خۆم لە رۆژنامەی وادا بینیـوە بـە خـەیاڵدا نایـەت و هـەرگیز دیمانـەی وام لەگـەڵدا نــەکراوە، وەلێ نــاتوانم نکووڵــی لێ بکــەم، چونکە دێڕ بە دێڕ، راستگۆیانە رای منی دەربڕیوە.

چاکترین دیمانەیش کە تا ئیستا لەگەل مندا سازکرابیت و، بە شیوازیکی روون تەعبیر لە سەختترین قۆناغی ژیانم، نەك تەنیا لەسەر ئاستی ئەدەب بەلکو لە سیاسەت و، زەوقی شەخسی و، خۆشی و ناخۆشیم کرابیت، ئەو چاوپیکەوتنە بوو کە پیش دوو سال لە رۆژنامەیەکی کەم ناوی کاراکاسدا بلاوبووەوە. کە لە سەرەتایەوە تا کۆتایی دەست هەلبەست بوو. ئەو چاوپیکەوتنە زۆری دلخۆش کردم، نەك تەنیا لەبەر راست و دروستی وردەکاریەکانی، بەلکو لەبەرئەوەی بە ناوی تەواوی ژنیکەوە کرابوو کە نەمدەناسی. وەلی من گومانم لەوە نەبوو ئەو زۆر خۆشی دەویم بۆیە بەو رادەیە دەمناسیت، تەنانەت ئەگەر ئەمە لە ریگای ئەوی تری منەوە بیت.

هەمان ئەم شتەم لەگەل کەسانیکی بە پەرۆش و خۆشەویستا تووش بووە کە لە هەر جیگایەکی ئەم دنیایەدا پیکگەیشتبین، بەردەوام یەکیك باس لە یادەوەری خۆشی شوینیك دەکات کە یەکترمان تیا بینیوە و من هەرگیز نەچوومەتە ئەو جیگایە، یان هاورییەکی زۆر خۆشەویستی یەکیکە لە ئەندامانی

خێزانەکەم کە من نایناسم، چونکە پێدەچێت ئەوی ترم وەك خۆم خزمی زۆر بێت. ئەگەرچی ئەوانیش خزمی ڕاستەقینە نین، بەڵکو کۆپی ئەوانن. زۆر جار لە مەکسیکو تووشی یەکێکیان دێم، باسی ئەو ئاهەنگە خۆشانەی بالیەم بۆ دەکات کە لەگەڵ هومبێرتوی براما لە ئەکا بولکو سازی دەکەن. دواجار کە بینیم سوپاسی کردم کە لە ڕێگای هومبێرتوی برامەوە خزمەتێکم پێکردبوو. من تەنیا ئەوەم پێوت ئەو کارەی من شایانی سوپاس کردن نییە، هەر ئەوەیشم لەدەست هات، چونکە هەرچەندم کرد دڵم ڕێگای ئەوەی پێنەدام پێی بڵێم من هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان برایەکم نەبووە بە ناوی هومبێرتۆوە کە لە ئەکابولکو ژیابێت.

نزیکەی سێ ساڵێك دەبێت، لە ماڵەکەی خۆمدا لە مەکسیکو تازە لە نان خواردن ببوومەوە، کەسێك لە دەرگای دا، یەکێك لە کوڕەکانم کە خەریك بوو لە پێکەنیندا دەتەقی پێی وتم: "باوکە، تۆ هاتوویت بە دوای خۆتدا دەگەڕێیت" لەسەر جێگاکەم ڕاپەڕیم و نەمتوانی بەر لە هەڵچوونەکەم بگرم "ئا، ئەمە خۆیەتی" بەڵام ئەویترم نەبوو، ئەندازیارێکی گەنجی

مەکسیکی بوو بە ناوی گابریل گارسیا مارکیزەوە، لاوێکی هێور و ڕەند. بەرگەی کارەساتی ناوەکەی گرتووە لە دەلیلی تەلەفوناتدا، ورياييەکەی وای لێکردبوو بە دوای ناونیشانی مندا بگەڕێت تا ئەو نامانەی لە ماوەی سێ ساڵدا لای کۆبۆتەوە بۆم بهێنێت، پێش ماوەیەکی کورت، یەکێك کە بە مەکسیکدا تێپەڕیبوو لە دەلیلەکەدا بە دوای ژمارەی تەلەفۆنی مندا گەڕابوو، کاتێك پەیوەندی گرتبوو وایان وەڵام دابووەوە کە ئێمە چووین بۆ خەستەخانە، چونکە کابانی ماڵ هەر ئێستا کچێکی بووە. چی لەوە بۆ من خۆشترە! بەڵام ئەوەی ڕوویدا ژنی ئەندازیارەکە چەپکێك گوڵی جوانی بۆ برا، بە ڕاستیی شایانیەتی، بە بۆنەی لەدایکبوونی کچەکەیەوە کە بە درێژایی تەمەنم خەونم بەوەوە دیوە کچێکم ببێت و ئیدی هەرگیز ئەو خەونەم نایەتە دی، نا، ئەندازیارە لاوەکە منی تر نەبوو، پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو: ئەو هاوناوی منە، بەڵام ئەوی ترم، هەرگیز نامدۆزێتەوە، چونکە نازانێت لە کوێ دەژیم، نازانێت من چۆنم، نایشزانێت وێنای ئەوە بکات من و ئەو چەندە جیاوازین. ئەو هەر چێژ

لـەو بوونـە وەهمیـەی خـۆی دەبینێـت کـە سـەیر و درەوشـاوەیە، لـە کەشـتیە تایبەتیەکـەی‌و لـە فڕۆکـە تایبەتیەکەیدا، لە کۆشکە ئیمپراتۆریـەکانیدا کە ژنـە دۆستەکانی بە شەمپانیا سەرگەرم دەکات و بە لێدان بەسـەر نـەیارە سـەرەکیەکانیدا سـەردەکەوێت. ئـەو بـە ئەفسـانەکەی مـن دەژی، دەوڵەمـەند تـا ئەوپـەڕی دەوڵەمەندی، لاوێکە هەر بە شۆخی دەمێنێتـەوەو تـا دوا فرمێسـکیش بەختـەوەرە، لـە کـاتێکدا منـی پـیر بێئەوەی داخی پێ بخۆم بـەردەوامم لەسـەر دانیشتن لەبـەردەم ئامێری چاپەکەمدا، بێئـەوەی گـوێ بدەمـە هەرا و زەنا و ناخۆشیەکەی، هەروەها هەموو شـەوێك گـەڕان بـە دوای هاوڕێیـەکی گیـانی بـە گیـانیدا بۆئـەوەی پێکـەوە چـەند پێکێـك هـەڵبدەین و یـادی بۆنی گەوافە بکەینـەوە، ئەمـەیش گـەورەترین زوڵمـە: چونکە ئەوەکەی ترم ناوبانگ دەردەکـات و، منیـش ژیان تێکم دەشکێنێت.

## ختووره بێ سیمەکان

دوێنێ شەو، پزیشکێکی فەرەنسی، پسپۆڕ لە دەمارناسیدا، کە لێکۆڵەرەوەیەکی بە ئارامە، پێی ڕاگەیاندم لە دەماخی مرۆڤدا ئەرکێکی تازەی دۆزیوەتەوە، لەوە دەچێت بایەخی زۆر بێت، پزیشکەکە تەنیا ڕووبەڕووی کێشەیەك ببووەوە نەیدەتوانی دەستنیشانی سوودی ئەو ئەرکە بکات، بە ئومێدێکی زۆرەوە لێم پرسی، ئەگەر ئەرکەکە بریتی بوایە لە ڕێکخستنی پێشبینی و ئەوەی لە خەوندا دەیبینین و ئەو ختوورانەی لە یەك کاتدا بە دڵی دوو کەسدا تێدەپەڕن، کارێکی باش دەبێت. پزیشکەکە تاقە وەڵامی ئەوە بوو کە بە چاوی بەزەییەوە لێی ڕوانیم.

من پێش هەژدە ساڵ، هەمان ڕوانینی ئەو پزیشکەم جارێکی تر دیبوو، کاتێك هەر ئەو پرسیارەم لەهاوڕێیەکی خۆشەویستم کرد، کە هەر

لێکۆڵینەوەی لەسەر دەماخی مرۆڤ بوو لە زانکۆی مەکسیکۆ. لەوساوە من رام وابووە، ختوورەی نێوان دڵی دوو کەس و شێوە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندیان بە جادووبازییەوە نییە، وەك هەندێك بێباوەڕ وا دەزانن، بەڵکو بەهرەیەکی ئەندامیی سادەیە، بەلاّم زانست قبووڵی ناکات، چونکە نایزانێت. وەك چۆن تیۆری خڕیەتی زەوی ڕەت کردەوە کاتێك بڕوای باو وا بوو زەوی تەختە. هاوڕێکەم، ئەگەر باش لە بیرم مابێت، پێی وابوو بەشێکی زۆر کەمی دەماخی مرۆڤ بە تەواوی ئەرکەکانی سەلمێنراون و لێی دڵنیان، بەلاّم بڕوای بەوە نەبوو کاری بەشێکی ئەو تۆپەڵە جەلاتینیە ئایندەبینی بێت.

من لەگەڵ پزیشکەکەی هاوڕێمدا گەمەیەکی ئەو ختوورانەم دەستپێکرد، وەڵ ئەو بڕوای پێنەدەکرد و بە ڕێکەوتی ڕووتی دادەنا، ئەگەرچی هەندێکیان زۆر ڕوون و ئاشکرا بوون. بۆ نموونە شەوێك بە تەلەفۆن پێم وت بۆ نانخواردن بێتە ماڵی ئێمە، دوای تەواوبوونی قسەکانمان زانیم خواردنی تەواو لە چێشتخانەکەماندا نییە، دیسان پەیوەندیم

پێکردەوە لەگەڵ خۆیدا بوتڵێك شەرابی دانسقە و پارچەیەك سۆسج بێنێت. مارسیدس لە چێشتخانەکەوە هاواری لێهەستا بۆ سابونێکی دەفرشتنیش، بەڵام تازە ئەو لە ماڵ دەرچووبوو، ئەوکاتەی بیستەکی تەلەفوونەکەم دادەنا، ختوورەیەکی سەیرم بە دڵدا هات کە دەشێت پەیامەکە گەیشتبێت و پزیشکەکەی هاوڕێم سابوونەکە بهێنێت. ئەمەم لەسەر پەڕە کاغەزێك نووسی بۆئەوەی گومان لە قسەکەم نەکات. هەر تەنیا بۆ بەریەك کەوتنێکی شاعیرانە، ئەوەیشم لەسەر پەڕەکە نووسی کە دکتۆر لەگەڵ خۆیدا گوڵێك دێنێت. دوای کەمێك خۆی و ژنەکەی دابەزین و ئەو شتانەی داوامان کردبوو دایانگرت، سابوونێکیش لەو جۆرەی خۆمان لە ماڵدا بەکاری دێنین، وەك داوای لێبوردنمان لێبکەن وتیان: "بە رێکەوت سۆپەرمارکێتەکە کرابووەوە و پێمان چاك بوو ئەم شتانەتان بۆ بهێنین" تەنیا گوڵەکەیان نەهێنابوو، لەو رۆژەوە، من و ئەو هاورێییەم، گفتوگۆیەکی جیاوازمان تا ئێستا لە بەیندایە. دواجار، کە لە پێش شەش مانگدا بینیم، هەموو

توانای خستبووە سەر ئەوەی شوێنێك لە دەماخدا دەستنیشان بكات كە هوشیاریی تێدایە.

ژیان زیاد لەوەی بە خەیاڵی ئێمەدا دێت بەم نهێنیانەوە جوانە. پێش كوشتنی یولیوس قەیسەر، كالبورنیای ژنی خەونێكی ترسناكی بینی، لە خەونیدا هەموو پەنجەرەی ماڵەكە بە توندی پێكەوە دەكرانەوە، بێئەوەی نە با هەبێت و نە كرانەوەی پەنجەرەكان هەرایەك بخەنەوە. دوای چەند سەدەیەك، سورتون ویلدەری ڕۆمانووس وتەیەك دەداتە پاڵ یولیوس قەیسەر كە نە لە یاداشتە جەنگیەكانیدا و نە لە ڕاپۆرتە مێژووییە سەرنجڕاكێشەرەكانیدا هەیە، بەڵام لایەنێكی مرۆڤایەتی ئیمپراتۆر دەردەخات كە لە هەموو شتەكانی تری چاكترە: "منێك هەموو ئەم پیاوانە لەژێر فەرمانمدان، خۆم لەژێر فەرمانی چۆلەكە و هەورەتریشقەدام". مێژووی مرۆڤایەتی -لەو كاتەوە كە یوسفی لاو لە میسردا خەونی لێكدەدایەوە- پڕە لەم بروسكە خورافیانە. دوانەیەك دەناسم زۆر پێكدەچن، لە یەك كات و لە دوو شاری لە یەكدی دوورەوە كاكیلەیەكیان دایە ئێش. كە پێكیش

دەگــەن هەســتێکی وایــان تێدەگــەڕێت بــیر و لێکدانــەوەیان تێکــەڵ بــە یــەکدی دەبێــت. چــەند ساڵێکی دوور لە ئێستا، لە ناوچەیەکی کەنارەکانی کاریبیدا دەرمانکەرێکم ناسی، بەوە دەنازی ئەگەر باسی ئاژەڵێکی بۆ بکەن و بە وردی شوێنەکەی بۆ دیاری بکەن، ئەو هەر لە دوورەوە دەتوانێت چارەی نەخۆشیەکەی بکات. مـن، بـەم دوو چـاوەی خـۆم ئەمەم بینی: مانگایەك بۆگەنی کردبوو، برینەکانی کرمی زیندوویان لێ دەکەوتە خوارێ، دەرمانکەرەکە لـە دووریـی چـەند سـەعاتەڕێیەکەوە لەبەرخۆیـەوە دوعـای دەخوێنـد. لەگـەڵ ئەمەیشـدا، لـە مێـژووی تازەدا، من تەنیا ئەزموونێکم لەبیرە کە ئەم توانایە بـە جیـدی وەرگـیرابێت، ئـەویش لـە لایـەن هـێزی دەریـایی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکاوە بـوو، کـاتێك لەگـەڵ کەشــتی ژێرئـاویی ئەتۆمیـەکانیدا، لەژێر سەهۆڵبەندانی قوتبیدا پەیوەندیان نامێنێت، هێزەکان دەیانەوێت بە ڕێگای ختوورەوە پەیوەندی پێکەوە بکەن. دوو کەس، یەکێکیان لە واشنتۆن و ئـەوی تـر لـە نـاو کەشتیەکەدا، هـەوڵی لەگـەڵ یـەکتر گونجـان و گۆڕینـەوەی نامــەی زەینــی نێوانیــان

دەدەن. بێگومان ئەزموونەکە سەری نەگرت، چونکە ختووره کارێکە لە خۆوە دروست دەبێت و هەرگیز کۆنترۆڵ ناکرێت، هیچ پرنسیپێکیش قبووڵ ناکات، ئەمەیش تاقە هۆی بەرگری کردنیەتی، هەموو نوقلانەیەك، هەر لە پێشبینیەکانی سەر لە بەیانیەوە تا ساڵە درێژەکانی نوستراداموس، لە درکپێکردنییەوە بە شێوەی ئاماژە پەیدا دەبن، تا تەواو نەبێت کەس تێی ناگات. ئەگەر وا نەبوایە، هەر لە سەرەتاوە خۆی دەدۆڕاند.

من ئەم قسانە بە تەواوی تایبەتمەندیەوە دەکەم، چونکە نەنکم –لە دایکمەوە– لە هەموو ئەوانەی کە دیومن لە زانستی نوقلانەلێداندا بلیمەتتر بوو، نەنکم کاسولیکیەکی نەوەی پێشتر بوو، واتا هیچ بڕوای بەوە نەبوو لە ڕێگای توانایەکی بەرنامەڕێژیەوە هەوڵی ئایندەبینی بدرێت. ئیتر ئەوە بە کاغەزی قومار بێت، یان بە خوێندنەوەی هێڵەکانی ناو لەپی دەست، یان بە ئامادەکردنی ڕۆحەوە بێت. بەڵام نەنکم لە نوقلانەلێداندا مامۆستا بوو.

لەبیرمـە لـە ماڵـە گەورەکـەی ئاراکاتامـاندا، کـە دەچووە چێشتخانە، لەو کولێرە خۆشانەی دەڕوانی کـە لـەناو فڕنـدا دەریدەهێنـان و دەیویسـت نیشـانە نهێنییەکانیان بخوێنێتەوە. ڕۆژێك لەو ڕۆژانە ژمارە (۰۹)ی لە پاشماوەی ئاردەکەدا بینی. دنیای هێنایە خوارەوە تا بلیتێکی یانسیبی کـڕی ئـەو ژمارەیـەی پێـوە بـوو. بلیتەکـە دەرنـەچوو، بـەڵام لـە هەفتـەی ئایندەدا قاوە کوڵینێکی بردەوە کە بە فشـار کـاری دەکرد، ئەمـەیش بە بلیتێـك باپـیرم هەفتـەی پێشـوو کڕیبووی و لە گیرفانی چاکەتەکەیدا لە بیری چوبوو، ژمارەکەشی (۰۹) بوو.

باپیرم حەڤدە کوڕی هەبوو، ئەوسا پێیان دەوتن کوڕە سروشتیەکان -وەك ئەوەی ئەو منداڵانەی لە ژن و مێردی ڕەسمی دەبن سروشتی نەبن و دەستکرد بن- نـەنکم هـەموو ئـەو منداڵانـەی بـە کـوڕی خـۆی دەزانـی. بـە درێژایـی ناوچـە کەناریـەکاندا بڵاوببوونـەوە، وەلێ نـەنکم هەمیشـە لـە کـاتی نـانی بەیانیدا باسی دەکردن، باسی تەندروستی و باری بازرگانی و کارەکانیـان، وەك ئـەوەی پەیوەندییـەکی ڕاستەوخۆی نهێنی لەگەڵیاندا هەبێت.

ناخۆشی ئەو سەردەمە لەوەدا بوو کە لە ناکاودا بروسکەیەك خۆی بە ماڵدا دەکرد، تەواو وەك ڕەشەبایەکی ترسناك، ئەم دەست و ئەودەستی پێ دەکرا و کەس نەیدەوێرا بیکاتەوە، تا یەکێك سروشێکی بۆ دەهات و دەیدایە دەست منداڵێکی چکۆڵە بۆ کردنەوەی، وەك ئەوەی پاکژیی منداڵەکە توانای گۆڕینی هەواڵە شوومەکەی هەبێت.

ئەمە ڕۆژێك لە ماڵمان ڕوویدا، ئێمە کە تەواو پێگەیشتبووین وەك دەست بۆ پشکۆیەکی سوور بەرین وابوو، نەماندەتوانی بروسکەکە بکەینەوە تا باپیرم نەیەتەوە، بەڵام نەنکم گوێی پێ نەدا و وتی: "ئەوە بروسکەی برودینسیا ئەگوارانە، هەواڵی خۆی بۆ تیا نوسیوین بەم زوانە دێت، ئەمشەو خەوم دیوە و بەڕێوەیە".

کە باپیرم گەڕایەوە ماڵێ بروسکەکە پێویستی بە کردنەوە نەبوو، چونکە برودینسیا ئەگوارانی لەگەڵدا بوو کە بە ریکەوت لە ویزگەی شەمەندەفەر دیبووی. برودینسیا کراسیکی لەبەردا بوو بە وینەی چۆلەکە رازابووەوە، باقەیەك گولی گەورەیشی لەگەڵ خۆیدا هینابوو، لەو بروایەشدا بوو کە سیحری

بروسکەکەی ئەو باپیرمی بۆ پیشوازی لیکردنی ناردۆتە ویزگەکە.

ئەنکم لە تەمەنی سەد سالیدا مرد بیئەوەی بلیتیکی یانسیب بەریتەوە، کویر بوو، دوارۆژەکانی ژیانی کەوتبووە ورینە و هیلەکانی عەقلی نەدەگیران. کە رادیو بکرایەتەوە جلی دانەدەکەند تا بەرگی خەوتن لەبەر بکات، ئەگەرچی هەموو شەویك ئەوەمان بۆ باس دەکرد کە بیژەری رادیۆ لە ژوورەکەدا نییە، ئەو وای دەزانی ئیمە دەیخەلەتینین، چونکە هەرگیز نەیدەتوانی بروا بەوە بکات کە ئامیریکی شەیتانی دەتوانیت دەنگی یەکیکمان لە شاریکی دوورەوە پی بگەیەنیت.

*ختووره بی سیمەکان: التخاطر اللاسلكي.

## ئاسانسەرەکانی چوارشەممە

لە فیلمی -ژیانی ئیرتشیبالدو دی لاکروز-ی دەرهێنەری نەمر -لویس بونویل-دا کارەساتێکی زۆر ناخۆش روودەدات، ژنێکی راهیبە لە دەرگای ئاسانسەرێکەوە دەرواتە ژوورێ، ئاسانسەرەکە لەو قاتەدا نەماوە، ژنە داماوەکە بە دەم ترس و زریکەوە دەکەوێتە خوارێ. ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر، رۆژنامەیەك هەوالی دوو میکانیکی بلاوکردەوە کە پسپۆری چاك کردنەوەی ئاسانسەرە لەکارکەوتووەکانن، دوومیکانیکیەکە لەژێر ئاسانسەرێکدا خەریکی چاککردنێن کە لە پرا ئاسانسەرەکە دەکەوێتە گەر و، بێئەوەی هیچ بیوەستێنێت بەسەریاندا دەکەوێت و هەردووکیان دەهارێت. ژن و مێردێکی هاوڕێم هەیە کچەکەیان لە تەمەنی دوانزە سالیدایە، بۆ ماوەی دوو سەعات لە ئاسانسەرێکی تاریکدا گیری خوارد، لەو کاتەوە لەو

ترسەدا دەژی و چاری نییە، ئەگەرچی چارەسەری پزیشکی و سایکۆلۆژی زۆری بۆ کراوە، ئەو مندالە -با بە جۆریکی زۆر کەمی دراماتیکی بیلیین- شیت بوو.

لە هەموو ئەم چیرۆکانە ترسناکتر لە بارەی ئاسانسەرەوە، رووداوەکەی کاراکاسەکە چەند سالیك لەمەوبەر قەوما. خیزانیك لە خانوویەکی سێ قاتدا دەژیا ئاسانسەری تیابوو، خیزانەکە بۆ ماوەی سێ مانگ چوون بۆ ئەوروپا، پیش چوونە دەرەوەیان کارەباکەیان لە سەعاتەوە بری وەك کاری ئاسایی هەموو جاریکیان، یەکیك لە کارەکەرەکان لە قاتی سەرەوەی خانووەکەدا دەمینیتەوە بۆ ریکخستنی، لەگەل خاوەن مالەکەیشدا ریکەوتووە کە لە کارەکەی بووەوە بە پلیکانەکاندا بیتەوە خوارێ و، دەرگای دەرەوە بە کلیل دابخات، هەفتەی جاریکیش بۆ پاکردنەوە سەر لە مالەکە بدات تا دەگەرینەوە، لەوە دەچیت لە کاتی چوونە دەرەوەی خیزانەکەدا شتیکی پەلەی بیر کەوتبیتەوە و ویستبیتی زوو بە ئاسانسەرەکە بیانگاتێ، بەلام لە نیوەی ریگادا کارەباکە

کوژابیتەوە. تا سێ مانگ کەس بەم رووداوەی نەزانی، تا خیزانەکە لە ئەوروپا گەرایەوە و لاشە دارزاوەکەی لە ئاسانسەرەکەدا دۆزیەوە.

من کە بە ناچاری دەچمە ناو ئاسانسەرەوە، ناتوانم بیر لەم چیرۆکە و گەلیك چیرۆکی ترسناکی تر نەکەمەوە، پیشتر کە لە ئوتیلە گران و کۆشکە گەورەکاندا سواری ئاسانسەرە نویکان دەبووم، ئەوانەی تەلەفونی لیقەومانیان تیابوو، زۆرم هەست بە دلنیایی دەکرد، بەلام رۆژیك ئەو بروایەیشم نەما، یەکیك لەوانەی لە ئاسانسەرەکەدا لەگەلما بوو تەلەفوونەکەی هەلگرت تا هەوالی وەستانیکی کتوپر بگەیەنیت بەلام کەس نەبوو وەلامی بداتەوە، ئەوسا پاساوەکەیان وا بوو ئەو کەسەی بۆ وەلامدانەوەی تەلەفوونەکە دانرابوو لەو کاتەدا چووە بۆ نیوەرۆژەخواردن. وەستانی ئاسانسەرەکەیش -لە چاکی بەختمان- هیچی وا نەبووە. لەو کاتەوە، لە هەموو ئاسانسەرەکانی دنیادا، وا راهاتووم سووسەی ئەوانە بکەم گوێ لە دەنگی ئامیری ئاگادارکردنەوەکە دەگرن کە دوگمەی سووریان پیوەیە و وینەی زەنگیکی

سووریش، زۆرجاریش قەناعەتم بە خۆم دەکرد کە هیچ سوودی نییە، بیجگە لەوەی هەستێکی دلنیایی کردن دەبەخشێتە ئەو کەسانەی تیایدان و لە واقیعدا وا نییە. لە راستیدا زۆربەی ئەو زەنگانە لە هیچ جێگایەکدا لێنادەن، چونکە کارناکەن و تەنیا لە خەیال و وەهمی ئەوانەدا هەیە کە لە ئاسانسەرەکە دان، کەسیش ئەمە نازانێت، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر دوور و درێژە کەس ناچاری بەکارهێنانی نەبووە، میکانیکییەکی ئاسانسەر لە مەکسیکۆ، ماوەیەك لەمەوبەر پێی وتم زەنگی ئاگادارکردنەوە، لە کاتی کارگوزارییەکانی پاراستنی رەسمیدا دەبێت هەمیشە چاودێری بکرێن، بەڵام کارمەندەکان لەسەرئەوە بەردەوام نین، چونکە میکانیکیەکان لەسەر خودی ئاسانسەرەکە راهاتوون و گوێ بەوە نادەن ئامێری ئاگادارکردنەوەکە کاردەکات یان نا، پاشان ئامێری ئاگادارکردنەوە -وەك یەکێکیان پێی وتم- لە زۆربەی کاتدا بێ سوودە، چونکە هەموویان بە کارەبا کاردەکەن. لە ئاسانسەرەکانیشدا کەم وەستان روودەدات کە پەیوەندی بە برانی کارەباوە

نەبیت، بۆیە ئامێری ئاگادارکردنەوە، بە هەمان ئەو هۆیانە لەکاردەوەستیت کە ئاسانسەرەکە لەکاردەخات.

لە ئاپارتمانەکاندا، تەنانەت لە زۆر گەورەکانیشیاندا، ئاسایی زەنگ لە ژووری ئەو دەرگاوانەدا لێ دەدات کە کلیلیکی ئاسایی پێیە و لە چرکەساتیکدا دەرگای ئاسانسەرەکەی پێ دەکاتەوە، گرفتەکە لەوەدایە دەرگاوانەکە بە بەردەوامی لەوێ نییە، ئەگەرچی ناوی خۆی بە خۆیەوەیەتی. زۆربەی زۆری ئەو دەرگاوانانەی چالاکن ئیمتیازاتی زۆریان هەیە -شایانی ئەوەیشن- وەك چوونە دەرەوەی کۆتایی هەفتە لەگەل خیزانەکانیاندا. چەند رۆژیك لەمەوبەر، لە ساختمانیکدا لە بەرشلونە، بە ریکەوت زانیان دەرگاوانەکە لە ژوورەکەیدا ناخەویت، بەلکو دەرواتەوە لای خیزانەکەی، واتا ئەگەر یەکیك لە ئاسانسەریکدا گیری خوارد، چاکترین شت ئەوەیە تا سەعات حەوتی سبەی بەیانی لەناو ئاسانسەرەکەدا لیی بخەویت.

دیاره ئەمه ئەگەر بەختی یار بیت، ئەی ئەگەر چارەرەش بوو؟ وەك ئەوەی لەو لیقەومانەدا بە تەنیا بیت و، کارەساتەکە لە چلەی زستاندا روویدات. لەوکاتەدا کاتیك بەیانی لێ دیت کە لەناو ئاسانسەرەکەدا رەق بۆتەوە.

لە بینایەکی نیشتەنیدا لە پاریس، کە سەر بەسەر ئالتوون دەژی، هەموو کارگوزاریەکانی زۆر نوێ کرانەوە، تەنانەت دەست بەرداری ژنە دەرگاوانەکانیش بوون، کە بە کۆنترین دامەزراوە و رەسەنی شار دادەنرین، لە رابووردوودا، ژنە دەرگاوانەکانی پاریس، بە راستیی ناوبانگیکی زۆریان هەبوو، تەنانەت ئەدەبی فەرەنسی، نەك تەنیا ئەدەبی بلزاك، بەلکو رۆمانی تاوانبار و پشکینەرەکان بە تایبەتی، بۆئەوەی چیرۆکە زۆر خەیالیەکان وەك حەقیقەت دەربکەون، دەبوو پەنا بەرنە بەر ئەو دەرگاوانانە. چونکە شایەتیدانی ئەوان لە دادگادا لەسەر یەکیك لە دانیشتوانی ئەو ساختمانە جیگای بروا و دەشیا زۆر شتی بېراندایەتەوە. بەلام ئیستا، هەموو رۆژیك، ژمارەیەکی زۆری ئەو دەرگاوانانەی پاریس،

دەگۆردرین بەو ئامیرە داهینراوە ئەلەکترۆنیانەی کە زۆر لە پیریژنە گەوجەکانی پیشوو چالاك و کاریگەرترن. بەلام بەهەرحال، ئەم ئامیرە داهینراوانە ناتوانن دانیشتوویەکی نەگبەت کە لە ئاسانسەریکدا بەند بووە رزگار بکەن. گیروگرفتی ئامیری ئاگادارکردنەوە لەو ساختمانانەدا کە دەرگاوانی تیا نییە چار کراوە، زەنگیك لە ئاپارتمانی لیپرسراوی ساختمانەکە دانراوە، ئەمە پلەیەکی کاتی و ناوەناوەیە، ئەو کەسەیش کە دەبیتە بەرپرس ناچار نییە لە مالەکەیدا بمینیتەوە و چاوەریی ئەوە بکات کەی یەکیك لە ئاسانسەرەکەدا گیردەخوات. دوا هەقیقەتیش ئەوەیە کە وازهینان لە ئاسانسەر بۆ ئەوانەی لە زیندانی کردن شیت دەبن، کاریکی دلخۆشکەرە، چونکە ئەوانە توانای بەرگەگرتنی هەموو شتیکیان هەیە بیجگە لە چرکەساتیکی بەندی بوون لە ئاسانسەردا.

باوو باپیرانمان کە جەخت و پیداگرتنیان زیاتربوو، لە هەمان کاتدا لە تیگەیشتنی ژیانیشدا مرۆڤانەتر بوون، کەسیان بیریان لە دروستکردنی

ئاسانسـەریکی لـەم بابەتـە بـاوەی ئـەمرۆی ئیمـە نەکردۆتـەوە کـە مـرۆڤ تیـایدا هەسـت بـە هیـچ دلنیاییـەك ناکـات. ئەمانـە تـەرمیکی ئاسـنینن. لـە نیویورکدا، کە خەلکی هۆشیارییەکی راستەقینەیان بە مەترسیی ئاسانسەر هەیە و، کە بە کاری دەهینن قیروسـیای لی دەکـەن. تـەنیا شـتیك مـاوە بـۆی بەکاربەرن ئـەویش ئاگادارکردنەوەیەکە کە بە گلـۆپ لە ناوەکەیدا نووسراوە، وەك چۆن لـە فرۆکەدا هەیـە "پشتینی دلنیایی ببەستە" کە دەچیتـە ئاسانسـەرە ئاپوورەکـانی مانهاتنـەوە، گویـت لـە کریکـاری ئاسانسـەرەکە دەبیـت وەك ژەنرالیك لـە شـەردا بیـت فـەرمان دەدات: "بەرانبـەر بەدەرگاکـە بوەسـتن"، بیگومـان ئەمـە کارئاسـانیە بۆئـەوەی زوو بچنـە دەرەوە. وەلی هۆی هەموو ئەم کارانە لەبەرئەوەیـە کە ئاسانسـەرەکانی ئیسـتا زۆر پتـەو و کونـبرە، کـەچی ئەوانـەی پیشـوو، باووباپیرانمـان دەیـانزانی رۆژانـە چۆنی بەکاردینن، بە گەشتیان دەزانی، بۆیە چیـژی زۆریـان لـە بـەکارهینانی دەبینـی. وەك کـاریکی هونـەری نەخشەسـازیان بـۆ دەکـرد، نـەك تـەنیا لـە تەکنیکدا، بەلکو لە تاشینیشدا. لە هـەموو لایەکیـەوە

پەنجـــەرەیان تیدەخســـت، ئەمـــە نـــەك تـــەنیا بـــۆ هەناســـەدان، بـــەلکو بـــۆ بینینـــی دیمـــەنی نـــاوەوەی ســـاختمانەکەیش. کـــەس لـــە ســـەرکەوتنا لـــە ترســـی برانی کارەبا هەناسەی بە تـەنگ نـەدەهات، بـەلکو کـە سـەردەکەوت ژیـانی دەبینـی؛ ئـەو دوو عاشـقەی بـە دەم ماچەوە چاوەریی گەرانەوەی ئاسانسـەرەکەن لـە قاتی یەکەمـەوە، ئـەو پیریژنە گردەنشینەی خـۆی وا دەردەخات لە بەردەم دەرگای ژووره کراوەکـەی قاتی دووەمـدا دانیشـتووە و شت دەچنیت. کـە لـە راسـتیا چیـــژ لـــە ســـەرکەوتن و دابـــەزینی ئاسانســـەرەکە وەردەگریت. یان هـەراو زەنـای ئـەو منداڵـەی دەسـتی مالئاواییمان بۆ رادەوەشینیت کاتیك بـە قاتی سیدا تیدەپـەرین. هـەموو ئەمانـە بـە هـاتنی ئـەم سـنووقە ئاسنینانە کۆتاییان هات، کە تەنیا تایبەتمەندییەکی باشیان هەیە -چونکە هـەر دەبیت تایبەتمەندییـەکی تیابیت- ئـەویش ئەوەیـە ئەم ئاسانسـەرانە لـە کـاتی کاری پەلەدا، کە ئەم حالەتـەیش زۆر روودەدات، زوو دینە دەست و فریادرەسن.

عاشـقەکان دەتوانن پەنجە بـە دوگمـەی وەسـتاندا بنیـــــن و، وەك کەلەشـــــیریکی خـــــەمۆك

خۆشەویستییەکەیان ئەنجام بدەن، کەچی لە قاتی ناوەراست، کەسانیکی دی جوین و ناسزا بۆ ئاسانسەرەکانی چوارشەممە دەنێرن کە بێ ئەوەی بە کەس بلین لە پرا و لەهەر شوینیکدا بیت لەکاردەکەون. بۆ بەخت چاکی ئەو شتانەی چ کەلکیکیان نییە. هەندیك جار سوودی گەورە دەبەخشن.

*وشەی (ئاسانسەر) وەك وشەیەکی کوردی تازە لە باتی (مصعد)ی عەرەبی و ئەسانسیری ئینگلیزی بەکارم هیناوە _ و _

*بەکارهینانی وشەی چوارشەممە Meircoles لە باتی وشەی Mierdaیە، کە لە زۆربەی ولاتانی ئەمریکای باشووردا بەکاردیت، بۆ پاکژکردنی وشەی ierda کە مانای "پیسی"یە.

## با پیاو بین و له ترسی ناو فرۆکه بدوێین

ئێمەی دانیشتوانی ئەمریکای لاتین، بێ شەرمکردن، بەلکو بە شانازییەکی پیاوانەیشەوە، دان بەو راستیەدا دەنێین کە لە فرۆکە دەترسێن. دەشێت لەبەرئەوە بێت لە ترسەکانی دی جیاوازە، چونکە پێ بە پێی بوونی ئێمە نەهاتووە، وەك ترس لە تاریکی و ترس لە خودی ترسان. ترسان لە فرۆکە نوێترین شێوەی ترسە، چونکە لەو کاتەوە هاتۆتە گۆڕی کە فرۆکەوانی داهاتووە، واتا لە حەفتاوحەوت ساڵ لەمەوبەرەوە، من خۆم ئەوەندەی لەگەڵدا دەژیم -بە شانازییەوە- کەسی تر وانییە، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆری ڕێز لێ دەگرم چونکە بە هۆی ئەوەوە لە هەشتا و دوو سەعاتدا هەموو دنیا گەڕاوم، بە لایەنی کەمەوە دە جار و لەناو هەموو جۆرە فرۆکەیەکدا.

ئەم ترسە، بە پیچەوانەی ترسەکانی ترەوە کە هەندیکیان بۆ ماوە و سروشتین، دەشیت فیری ببیت. من بە خۆشیەوە ئەو گەشتە بەتامانەی ناو فرۆکەم لە یادە کاتیك لە خویندنی دواناوەندیدا بووم، بەو فرۆکە دوو پەروانانەی بەناو پۆلە چۆلەکەدا دەفرین، گاگەلیان دەترساند و، هەوای پەروانەکانی گولیلکەی زەردی ناو پاوانەکانی دەتۆقاند. هەندیك جاریش بۆ هەتاهەتایە لەناو هەورەکاندا ون دەبوو، دەبوو بە ناچاری لە نیوەشەودا بە شیوەیەکی سروشتی و مەنتیقی بە دوای خۆلەمیشەکەیدا بگەرییت؛ بە سواریی هیسترەوە.

جاریکیان، کە لە یەکیك لە رۆژنامەکانی بوگوتادا نووسەری بەشی لیکۆلینەوە بووم، لە قۆناغیکی ناواقیعیدا کە تەمەنی هەموو خەلکی بیست سالان بوو، لەگەل غیللیر موسانشیسی وینەگردا ناردمیان بۆ بەدواچوونی هەوالیکی شووم، بە فرۆکەیەکی تەر و وشك (برمائی) مودیلی کاتالینای پاشماوەی جەنگ، بەسەر دارستانەکانی ئورابادا کەوتینە فرین و، بەسەر باقەگسکەکاندا

هەلکورمابووین، چونکە لەو تەرمە فریوانەدا نە کورسی دانیشتن هەبوو، نە ئەو کچە میواندارەی پرسە دەنێرێ و دەشێت یەکیکمان ژمارەی تەلەفوونەکەی بەهەشتی لێ داوا بکات. لە پریکدا فرۆکەکە ریگای هەلە کرد و لەناو لیزمەیەکی تەوراتیدا ویل بوو، بارانەکە تەنیا لە دەرەوە نەدەباری، بەلکو لەناو خودی فرۆکەکەیشدا. هاوکاری فرۆکەوانەکە بە هەزار حال گەیشتە لامان، رۆژنامەی بۆ هینابووین تا سەرمان لە دلۆپەکان بپاریزین، ئیمە لەوە سەرسام بووین کە هەردوو دەستی دەلەرزی و نەیدەتوانی بدویت.

ئەو رۆژە من شتیکی زۆر باش فیر بووم: فرۆکەوانەکانیش دەترسن، وەلی ترسی ئەوان، چون ئەوانەی شەرەگا ئەکەن، لەدەست لەرزیندا نییە وەك ئەوانەی لە خورافات دەترسن. ئەمە هاورییەکی ئیسپانیم پەی پی برد -هاوریکەم هیند دەترسیت لەناو فرۆکەدا دانانیشیت و هەمیشە بە پیوەیە- کە لە شەویکی شوومی زستاندا، لە نیویورک لە باگیژەیەکی بەفریندا، هاوریکەمیان بردبووە ژووری کاپتنەوە تا بە چاوی خۆی

هەستانی فرۆکە ببینیت، هەموو فرۆکەوانەکان بە هیوری لە پیش شوین هەستانی فرۆکەکەدا دەوەستن، تا فەرمانی هەستانیان دەدریتێ، ئەوسا، وەك ئەوەی ئەرکیکی هونەریی پیویستیان لەسەر بیت. پیکەوە، بە شیوەیەکی هارمۆنی و گونجاو نیشانەی خاچ دەکیشن. کە هاوریکەم. لە ناخەوە هەستی بەوە کرد فرۆکەوانیش دەترسیت. ئیتر بۆ هەتاهەتایە ترسی لە فرۆکە شکا.

لە کاتی گەرانی ناو ئەستیرەکاندا بەسەر ئۆقیانووسی ئەتلەسیەوە، من تووشی ئەزموونیکی لەمە کاریگەرتر بووم. لەگەل کاپتنی فرۆکەکەدا لە هەموو بارەیەکەوە دەدواین. من هەوالی هاورییەکی فرۆکەوانی خۆمم لێ پرسی کە لە قوتابخانە لەگەلما بوو، ئەم دەزانی لە کاتی نیشتنەوەی فرۆکەکەیدا، لە فرۆکەخانەی تینریفی لە زریانیکدا کەوتۆتە خواریێ و گیانی لەدەست داوە -کاپتنەکە بە شیوەیەکی تر ئەمەی پی وتم- بەلاّم روونتر، وتی: سێ سال دەبیت لە کەنارەکانی کاریبیدا خانەنشینە.

لەگەل ئەمانەیشدا، چ پەیوەندییەك لە نیوان ترس لە فرۆکە یادی بەخیر بیت و کارەساتی ئاووهەوادا نییە. بیکاسۆ جوانتر ئەمە دەردەبریت: "من لە مەرگ ناترسم، بەلام لە فرۆکە دەترسم" زیاد لەمانە، زۆریك لەوانەی ترسیان لە فرۆکەیە، دوای ئەوەی لە کارەساتیك رزگار بوون ئەو ترسەیان نەماوە. وەلی من وەك پەتای نەخۆشیەکی بی چارەسەر، لە کاتی سەفەریکی نیوەشەوی نیوان مەیامی و نیویورکدا، بە فرۆکەیەکی هاویژەر تووش هاتم، ئاووهەوا هیور و فرۆکە لە ئاسماندا سەقامگیر بوو، لە پالیشیا، ئەو ئەستیرە تەنیایە بوو کە هەمیشە هاودەمی فرۆکە خیرەکانە، من لە پەنجەرەکەوە، بە هەمان ئەو خۆشەویستییەوە لیم دەروانی کە سانت ئەکزوبیری لە فرۆکە ئەلەمنیۆمەکەیەوە ئاگردانەکانی بیابانی دەبینی. لە پرا، لەو رامانەدا، وام بە بیردا هات کە لە باری فیزیاییەوە هەرگیز نابیت فرۆکە بەو ئاسمانەوە بوەستیت. بۆیە سویندم خوارد هەتا ماوم جاریکی دی سواری فرۆکە نەبم.

سویندەکەم تا دە سال نەخست. تا ژیان ئەوەی فیر کردم ترسنۆکی راستەقینە ئەو کەسە نییە لە فرۆکەوانی دەترسیت، بەلکو ئەو کەسەیە بە ترسەوە فیری فرۆکەوانی دەبیت، نەگبەتییەکە لەمەیاندایە. تەنیا کەسیك لەناو ئەو ناودارانەدا کە من دەیانناسم و سواری فرۆکە نابن، تەلارسازی بەرازیلی ئوسکار نیمیرە. وەلی جورج ئامادۆی هاوولاتی ئەو، لەوانە بوو کە زۆری حەز لە فرۆکە دەکرد، بویرییەکی شاعیرانەی هەبوو لە سواربوونی فرۆکەی کۆنکۆردا لە پاریسەوە تا نیویورك، لەوییشەوە پاپۆریك دەیگەیاندە ریودو جانیرۆ. بەلام نووسەری ڤەنزویلی میگیل ئوتریو سیلفا و دەرهینەری سینەمایی رووی گیرای بەرازیلی، بە دوو شیوازی جیا گەیشتنە ئەوەی تاقە هۆی بەرەنگاریکردنی ترس لە فرۆکە ئەوەیە بە ترسەوە سواری ببیت. وەلی کارلوس فونتیس، کە بۆ ماوەی پانزە سال سواری فرۆکە نەبوو، گەشتی مەلحەمیانەی هەشت رۆژی دەکرد و، چەندان شەمەندەفەری نیوان مەکسیکۆ و نیویورکی دەگۆری. نەك هەر نەگەرایەوە سەر سواربوونی

فرۆکە، بەلکو بە سواریی فرۆکەیەکی تاك پەروانە بۆ وتاربیژییەك چوو بۆ زانکۆی ئەندیانا. گەورەترین پسپۆری ترسیش لە فرۆکە لە دون لویس بونویل چاکتر نەبووە. کە تا تەمەنی هەشتا سالی بە هیوریی سواری فرۆکە دەبوو، لەگەل ئەوەیشدا کە خەریك بوو لە ترسا گیانی دەردەچوو، ئەو زیاتر ئەوکاتە دەتۆقی کە فرۆکەکە لەوپەری هیمنی و باشیدا بوو، کەچی لە ناکاویکدا کاپتنەکە بە کراسیکی قۆل کورتەوە لەسەرخۆ دەکەوتە پیاسە و، بە زەردەخەنەیەکی بریقەدارەوە سلاوی لە گەشتیارەکان دەکرد.

دایکم، بە دریژایی تەمەنی دووجار سواری فرۆکە بووە و هەرگیز هەستی بە ترس نەکردووە، بەلام زۆر چاك دەزانیت کورەکانی چەند دەترسن. - دوانزە کورن- بۆیە بەردەوام لە کاتی سەفەری ئیمەدا و بۆ پاراستنمان مۆمیك لە مالدا دادەگیرسینیت. ئەمەندەیش بروای پییەتی جاریك یەکیك لە کورەکانی، کە ئەندازیاری ریگاوبانە، ماوەیەك لەوەوبەر لە نزیك ریگاکەوە بلدۆزەریکی بۆ ناو چالیك هەلدیرابوو، لە کاتی قسەکردندا دایکم

زانی بژاردنی زیانەکەی لەسەد هەزار بیزۆ زیاترە، دایکم پێی وت تاقە قرشێك نەدات. چونکە مۆمێك بۆ دەرهێنانی بلدۆزەرەکە دادەگیرسێنیت. براکەم بەسەر زەنشتەوە پێی وت: "ئەوە تەنیا بە خەیالی تۆدا دێت کە مۆمێك بلدۆزەرێك لە چال دەربهێنێت" دایکم بە تەواوی بروا بەخۆبوونەوە وتی:

-چۆن دەریناهێنێت! ئەو فرۆکە بە ئاسمانەوە دەپارێزێت.

## چارەسەریەکانی فرین

جاریکی تر، خۆم تووشی ئەو گەوجایەتییە کردەوە کە بریارم دابوو هەرگیز دووبارەی نەکەمەوە، ئەو گەلۆرییەش بازبازینی شەوانی سەر ئەتلەسی بوو بی ئەوەی ویستگەیەکت بیتە سەر ری، دوانزە سەعاتی تەواوی نیوان ئەمبەر و ئەوبەر. کە نەك تەنیا شوناس، تەنانەت چارەنووسیشت تاریکە. وەلی ئەمجارەیان گەشتەکە تا ئەو رادەیە توندوتۆل بوو، کە لە چرکەساتیکدا وام بە بیردا هات رەنگە فرۆکەکە بەسەر ئوقیانووسەوە بوەستیت و فرۆکەیەکی تر بیت و هەلمان بگریت. مەبەستمە بلیم جاران لەوە دەترسام فرۆکەکە بکەویت، وەلی ئەمجارە ترسیکی ترم لینیشت، رەنگە بۆ هەتاهەتایە فرۆکەکە بە ئاسمانی ئەتلەسیەوە بمینیتەوە.

لەو ساتە دزیوەدا، دەرکم بەوە کرد هۆی چییە ئەو ژەمە خواردنەی لە ئاسماندا دەتدەنێ لە ژەمە خواردنی سەرزەوی جیاوازە. چونکە مریشکەکان - بە مردوویی و برژاوییش- لە ترسا بالدەگرن و، بلقە بلقی شەمپانیا پیش وادەی خۆی دەمریت و، زەلاتەیش بە داخیکی ترەوە پەژموردە دەبیت، فیلمەکانی سینەمایش هەروەکو ئەوانی لیدیت. ئەوەی من بینیومە، لە ئاسماندا ناوەرۆکی هەندێ فیلم دەگۆریت. چونکە گیانی ئەکتەرەکان بەرگرییەکی زۆر لە زاتی خۆیان دەکەن. بەلام ژیان بە لۆژیکە تایبەتییەکەی خۆی، بە قەناعەت پینەکردن کۆتایی دیت. بۆیە لەناو فرۆکەدا چاوەریی فیلمی چاك ناکریت، بەلکو زیاد لەمە چەند فیلمەکە دریژ و بیزارکەر بیت، تۆ زیاتر دلنیا دەبیت، چونکە ناچاریت خەیال لە داهینانی زیاتر بکەیتەوە وەك لەوەی کە دەیبینیت. ئەمەیش ترست لەبیردەباتەوە.

ئەم جۆرە چارەسەرە لە ژمارە نایەت، ژنیکی هاوریم هەیە پیش چوونە سەفەر بە چەند رۆژیك خەو لە چاوی ناکەویت، بەلام کە لە ئاودەستی ناو

فرۆکەکـــەدا خـــۆی مـــەڵاس دەکـــات بـــە تـــەواوی ترسەکەی دەرەویتەوە، بە سەعات تیا دەمینیتـەوە، هینـد بـە دلنیـاییش دەخوینیتـەوە دەلیـی میـش میوانـی نییـە، تـا کاربەدەسـتانی فرۆکەکـە بـە زۆر دەیگیرنـەوە سـەر کورسـیە ترسـناکەکەی. شـتیکی سەیرە، چونکە من هەمیشە وام بیرکردۆتەوە نیوەی تـرس لـە فرۆکـە لـەو زیندانـی هەناسـە بـە تـەنگ هاتنەوەوەیـە. لـە هیـچ جیگایەکیشـدا وەك سـەرئاو هەسـت بـەو هیـزە ناکریت. بـەڵام لـە ئاودەسـتی نـاو شـەمەندەفەردا، هەسـت بـە ئازادییـەکی بـی وینـە دەکـەیت. کـە منـال بـووم، لـە گەشـتی نـاو شـەمەندەفەرەکانی مـۆزدا، شـەیدای تەماشـاکردنی دنیـا بـووم لـە کونـی ئاودەسـتی فارگۆنەکانـەوە، ژمارەی نووستوانی نیوان دوو گوند، سلەمینەوە و شلەژانی قۆمقمۆکەکانی ناو گژوگیا، ئەو کچۆڵانەی لـە چاوترۆکـانیکدا بـە رووتـی دەیـانبینیت کـاتیك لەژیر پردەکاندا مەلە دەکەن.

کە یەکەمجار سواری فرۆکەیەکی دوو پەروانەی سـەرەتایی بـووم، ئەوانـەی هـەزار کیلۆمـەتر بـە سـێ سـەعات و نیـو دەبرن، بـە سـادەیی خـۆم بـیرم لـەوە

کردەوە، کە من، لە کونی ئاودەستیکەوە ژیانیکی زۆر لەوە دەولەمەندتر دەبینم کە لە شەمەندەفەردا هەیە، دەزانم چی لە حەوشی مالەکاندا روودەدات. چۆن گاگەل بەنیو گولالە سوورەدا تیدەپەریت، پلنگەکەی هەمەنگوای چۆن لەنیو بەفری کلیمانجارۆدا بەستوویەتی. وەلی ئەو شتانەی دەمبینین زیاتر خەمی ئەوەیان دەدامێ کە ئەو چاوە بەسەر ژیانەوە چاویکی کویرە. لە کاتیکدا کاریکی سادەی وەك بەردانی ئاویك تا سنووری مەرگ سەرکیشی دەویت.

دەمیکە دەستم لەو وەهمە باوە شتووە کە دەلیت مەستەمەنی هۆیەکی سەرکەوتووە بۆ چارەسەرکردنی ترس لە فرۆکە. بە پیی هاوکیشەکەی لویس بونویل، پیش ئەوەی لە مال بچمە دەرەوە پیکیك لە مارتینیسکم هەلدەدا، پیکیکی تر لە فرۆکەخانە و سییەمیش لە کاتی هەستانی فرۆکەکەدا. بیگومان، یەکەمین چرکەساتەکانی فرین لە سەرخۆشیەك دەچوو کاریگەرییەکەی بە پیچەوانەی ئەوەوە بیت کە مەبەستە، چونکە دلنیاییەکە دەبووە واقیعی و

کاریگەرییەکەیش تا رادەیەك بوو کە مرۆڤ خۆزگە بەوە بخوازیت فرۆکەکە بکەویتە خوارێ بۆئەوەی جاریکی تر بیر لە ترس بکاتەوە. ئەم ئەزموونە ئەوەی لا دەسەلماندین کە هەریەکیکمان لەوە بگات خواردنەوە ترس زیاتر ئەکات نەك نایهیلیت. لە سەفەری دوور و دریژدا لە مەستیی خراپتر نییە؛ چونکە دەشیت لە دوو پیکی هەوەلدا کەسیك ئاسوودە بیت، دوو پیکی دووەم سەرخۆش و پاشان خەوی لی دەکەویت، ئەو خۆی بە وەهمیك دەخەلەتینیت کە بە راستیی نووستووە. دوای سێ سەعات هەلدەستێ و بروایشی وایە تەنیا سێ دەقیقە خەوتووە، بۆ ئایندەیش بیجگە لەسەر ئیشەیەکی دە سەعاتی هیچی تر نامینیتەوە.

بەلام خویندنەوە -کە بە کەلکترین چارەسەری بەلا زۆرەکانی سەر زەویە- ئەویش لە ئاسماندا بە هیچ جۆریك وەك خۆی نامینیتەوە. چونکە مرۆڤ دەتوانیت دەست بە خویندنەوەی رۆمانیکی زۆر چاکی پۆلیسی بکات لە رووی چنینەوە، بەلام کە لیدەبیتەوە نازانیت کی کیی کوشتووە و بۆ کوشتوویەتی. من بروام وایە کەس لەو بەریزانە

ترســنۆكتر نییــە كــە لــەناو فرۆكــەدا خۆیــان وا دەردەخەن زۆر بێباكن و لە خوێندنەوەدا چاو لێك نانێن، تەنانەت هەناسەیش نادەن، ئەمە لەو كاتەدا كە كەژاوەكە بەناو دنیایەكی ناهەمواردا رۆدەچێت.
من خۆم یەكێكی لەم بابەتەم دیوە، لە شەوێكی دوور و درێژی نێوان نیویۆرك و رۆمادا بە نێو ئاسمانی سەختی قوتبی باشووردا. لە تەنیشتمەوە دانیشتبوو، هێند بە پەرۆشەوە تاوان و سزای دیستۆفسكی دەخوێندەوە تەنانەت وازی لە شێوخواردنیش هێنا، دێر بە دێر و لاپەرە بە لاپەرە رۆمانەكەی دەخوێندەوە. بەڵام لە كاتی ژەمی بەیانیدا هەناسەیەكی هەڵكێشا و وتی: "پێدەچێت كتێبێكی گرنگ بێت" لەگەڵ ئەوەیشدا نووسەری ئۆرگوایی كارلوس مارتینس مورینو جەخت لەسەر ئەوە دەكات لە كاتی فڕیندا لە كتێب چاكتر نییە.
لە ماوەی بیست ساڵی سواربوونی فرۆكەدا هەمیشە بەرگێكی نیمچە دڕاوی رۆمانی مەدام بۆڤاری پێبووە. خۆی بە خوێندنەوەیەوە خەریك كردووە، تا رادەیەك هەمووی لەبەر بووە، چونكە وای داناوە چارەسەریەكی تەواوە لە دژی مردن.

مـن بیجگـه لـه موسـیقا چ ریگایـهکی دیـم لا کاریگەر نەبووه، نەك ئەو مۆسیقایەی لەناو خودی فرۆکەکـەوه لیدەدریـت، بـەلکو ئـەو کاسـیت و ریکوردەرەی بە خۆمە. لە راستیدا مۆسـیقای نـاو خودی فرۆکە کاریگەرییەکی پیچەوانەی هەیە. من هەمیشـه سەرسـامیی خـۆم لـەم پرسـیارەدا دەردەبری: کین ئەوانەی لە گەشتە ئاسمانیەکاندا بەرنامەی موسیقا هەلدەبژیرن. چونکە بەلای منەوه سەرنشینەکان لەوان زیاتر ئاگادارن کە مۆسیقا چ تایبەتمەندییەکی بۆ چارەسەر هەیە، بە پیودانگە هەرە سادەکەیان، ئەو مۆسیقایە بە چاك دەزانن کە لە ئۆرکسترایيە گەورەکانە و پەیوەندی بە ئاسمان و فەزای بی کۆتایی و دیاردەکانی زەویەوه هەیە. "ئۆرکسترا پیست ئەستوورەکان" وەك براهمز ناوی لە کارەکانی بروکنیر دەنا. وەلی من بۆ نـاو فرۆکـە موسیقای تایبەتی خۆم هەیە، لە ژمارەیش نایەن، بەرنامـەی تایبـەتی خـۆم هەیـە، بـە پیـی دوور و نزیکی و خەتی گەشتەکە و، ئایا کاتەکە رۆژە یان شـەوه، هـەروەها بـە پیـی ئـەو فرۆکەیـەی سـواری دەبم، بۆ نموونـه لـه مـەدریدەوه بۆ بویرتریکـو، کـە

گەشـــتیکی ئاســـاییە بـــۆ ئەمریکییـــەکانی لاتـــین، بەرنامەکـــە ورد و پتـــەوە: ســـەمفۆنیای نۆیـــەمی بتـــهۆڤن. مـــن وام دەزانـــی -وەك پیشـــتر وتم- هیـــچ شـــتیك بـــە ئـــەندازەی مۆســـیقا چارەســـەری فریـــن ناکات. تا بۆ نەگبەتی من ئەم هەفتەیە خوینەریك لە کیانتیـــەوە بـــۆی نووســـیوم دەلیـــت ئـــەو ریگایـــەکی باشتری دۆزیوەتـــەوە: بـــە پیـــی توانـــا، چـــەند جـــاریك پەیوەندی سیکسی لە کاتی فریندا.

## خۆشەویستی لە ئاسماندا

گەشت -وەك دەسەڵات- هەوەس بزوینە، ئەگەر ئەو یاداشتانەی کەشتیەوانەکان دەینووسن هەموو راستییەکانیان لە خۆ بگرتایە دەبوونە دەقیکی بی وینەی ئەدەبی تابو. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە شەوانە لەسەر ئەو پاپۆرانەی سەرنشینیان تیایە هەرگیز گۆشەیەك نابینیتەوە رووناك نەبیت.، ئەو کەسانەی ئەزموونی گەشتی ناو دەریایان هەیە، بە تایبەتی لە کاریبیدا، ئامۆژگاریی تازە کارەکان بەوە دەکەن کە هاتن لەگەل خۆیاندا کلیلی ئینگلیزی بینن تا گلۆپەکانی پی بشکینن.

شەمەندەفەرە کۆنەکانی ئەوروپا، بە دریژایی ساڵانیك، ئوتیلی رابواردن و لەزەت بەخشین بوون.

شەمەندەفەری خیرای خۆرهەڵات، بیجگە لەوەی شانۆی تاوانکردنی بەردەوام و مەکۆی سیخوران بوو. بەهەشتیکی شەوانیش بوو کە لە فارگۆنە بی

ئـەژمارەكانیدا چـەندان سـك بـە سـێ كەللـەی تـاج لەسـەر پـر دەبـوون. لـە میـترۆی شـاری مەكسـیكۆدا، هـەر لـە بـەر هـەمان هـۆ، دەبـوو بـە رۆژی نیـوەرۆ ماشـینی ژن و پیـاو جیابكرینـەوە، نـەك لـە كـاتی كەمبوونی خەلكیدا، بەلكو تەواو بە پیچەوانەوە: لە كاتی ئەوپەری جەنجالیدا.

بـەلأم فرۆكـەكان، بـۆ مـاوەی سـالأنیكی دوور و دریـژ، خۆشەویسـتی كـردن تیایـاندا قەدەغـە بـوو، تەنانەت لای ئیمە پشتینی كورسییەكان بریتییەكی لەباری پشتینی پاكیزەیی بوون. رەنگە هـەر ئەمـە پەرچـەكرداریكی لەسـەر ئـەو تۆلەیـە دروسـت كردبیت، ئەویش دەمگۆیەكی خورافی سەرانسـەری بـوو كـە كچـە میواندارەكـانی نـاو فرۆكـە ئاسـان بەگیردین. خـەیالی هەرزەكارانـەمان وای پیدەوتـین ئـەو كچانـە كارامـەن لـە هـەموو شـیوازیكی كـاری سیكسـیدا. چـەند سـالیك لەمەوبـەر لـە بارانكیـادا وا بلأوبووەوە، لە یەكیك لە گەرەكە پیشكەوتووەكاندا مـالیكی سـۆزانی دەكریتـەوە جوانـترین كچـە كارمەندی كۆمپانیای فرۆكەوانە جیهانییـەكان كـارە بە تامەكەی خۆیانی تیا دەفرۆشن. هـەر ئـەو شـەوە

هەمووومان چووین، لە جەنابی پاریزگار و دەستە و دایەرەکەیەوە بیگرە تا ئەو رۆژنامەنووسەی کەمترین مووچەی هەبوو. بەراستییش پۆلیك کچی شۆخی لیبوو، بە نیشانەی تایبەتی هەموو کۆمپانیا ئاسمانیەکانی دنیاوە، ئەسوجیاکانی کۆمپانیای "ساس" ئەلمانیەکانی "لوفتهانزا" ئەمازۆنیەکانی "پان ئەمریکانی" جیهانی. لە خوامان دەخواست ئەو درۆ گەورەیە راست دەربچیت. تەنانەت زۆربەمان خۆی وا لە قەلەم ئەدا کە نەیزانیوە هەموو کچەکان دوورەگن وەك ئەوانەی خۆمان و، بی زمان قورسی بە قشتالی قسە دەکەن. بە شیوەیەکیش دەپەیڤن تا رادەیەکی زۆر لەو شیوە باوە دەچوو کە لە کارگەی خەونەکەی بیلار تیرنیرادا بەکاردیت.

یەکەمین جار لە بارانکیا گویم لەو قسە جیدیە بوو کە دەشیت لە فرۆکەدا کاری سیکسی بکریت. لەگەل فرۆکەوانیکی ئەلمانی بە ئەزموونداا رومی سپیم لەگەل تویکلە لیمۆدا دەخواردەوە. فرۆکەوانەکە لە کاتی داهاتنی فرۆکەی هاویژەردا خانەنشین کرابوو، چونکە ئەوەی بە بیردا نەهاتبوو

فرۆكە بی پەروانە بفریت. ئەو ئەم زانیارییەی دامێ كە لە فرۆكەی -كونستیلیشن-ی زۆر گەورەدا كە هی كۆمپانیایەكـــە قەرەویلەیـــەك هەیـــە دەتوانیـــت بیپیچیتـەوە، وەك ئەوەی لـە فارگۆنی شـەمەندەفەردا هەیـە، كەســـیش لـــەو ســـەفەركەرانەی نەدەپرســـی ئەوەی بۆ خـەو بـەكرییان گرتووە، چی تیـا دەكـەن. بەراســـتییش ئـــەو كەســـەی نەخشەســـازی ئـــەو قەرەویلانـەی كردبـوو "هـوارد هۆگس"ی داهینـەری فرۆكـەی كونستیلیشــنە، ئـــەو لەبـــەر بـــەرژەوەندی شەخسیی خۆی لەگەل كچە ناودارەكانی سینەمادا و سازكردنیان ئەوەی كردبوو. دەبوو سـالانیكی دوور و دریژ بەسەر بچیت تا فیلمیكی سینەمایی پركیشی ئەوە بكات پرۆسـەی سیكس لـەناو فرۆكـەدا پیشـان بدات.، بۆ یەكەمین جار ئەمە لە فیلمی ئیمـانوئیلدا دەركـەوت. بـەلام بـە راسـتی كـاریكی زۆر سـەخت و ورەی بـــەرزی گـــەرەك بـــوو، وەك ئـــەزموونیك هاتـــە بەرچاو جەخت لەسەر ئەوە بكات هەرگیز نەگونجیت لەناو فرۆكەدا سیكس بكەیت.

وەلی لـە ئیسـتادا، ئەوانـەی لـە فرۆكـەی جیـت - سیتا سـەفەر دەكـەن كارەكـەیان لا ئاسـاییە، تـەواو

وەك ژیانی واقیعی زۆر و لیزانانە دەیکەن. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا کۆمەڵەیەکی مەدەنی هەیە بە ناوی "میل های کلوب" Mile high club ەوە، تەنیا ئەوانە بە ئەندام وەردەگریت کە توانیویانە لە بەرزایی زیاد لە میلیکەوە مومارەسەی سیکسیان کردووە. ئەندامیشیان زۆرە. هەموویان رایان وایە ئەگەر گرفتیك لەو مەسەلەیەدا هەبیت، وەك هەر مەسەلەیەکی دی، لە سەرەتاکەیدایە، گەشتیکی شەوانەیش هەیە لە لوس ئەنجلسەوە بۆ مەیامی یان لە لوس ئەنجلسەوە بۆ نیویورك، ناوەکەی پر بە پیستی ناوەرۆکەکەیەتی، "رید ئایز ئیکسپریس" Red Eyes Express واتا ئیکسپریسی چاوە سوورەکان. ماوەی گەشتەکە حەوت سەعاتە، تاقە شتیکی قەدەغەکراو لەو گەشتەدا خەوە، بۆئەوەی کە سەفەرکەران گەیشتنەوە شوینی خۆیان ماندوویەتی شەویان بە چاوەوە دیاربیت.

جیاوازی نیوان رید ئایز ئیکسپریس و گەشتە بازرگانییە ئاساییەکان -بیجگە لە نرخی بلیت کە زۆر کەمە- لە یەکەمیاندا هیچ جۆرە سانسۆریك نییە، چ دەسەڵاتیکی تیا نییە بیجگە لە دەسەڵاتی

فرۆکەوانـەکان کـە بـە دریژایـی گەشـتەکە لـە ژووره داخراوەکەی خۆیاندا سـەردەرناهینن. نـەك پریشکی ئــەو کارەیــان بگاتــێ کــە خۆیــان دایانــهیناوه. سـەفەرکەران خـواردن و خواردنـەوەی خۆیـان پییـە، هەروەها مەستەمەنی و مۆسیقای تایبـەتیان، هـەموو دەسـەڵاتی تـەواویان بەسـەر جەستەیاندا هەیە. واتـا هەریەکـەیان لـەناو گەشـتەکەدا گەشـتیکی تریـش دەکات. کەس لە کەس ناپرسیت کییە و لـە کویـوە هـاتووە، لـەو گەشـتە بابلیانـەدا چــرا کوژاوەیــە و ئاسانترین شت سیکسە.

کە قسە لەم مەسەلانە دەکریت هەڵەیـەکی بـاوت دیتــەوە بــەر زەیــن. ئــەوەیش بیرکردنەوەیــە لــە ئاودەســتی نــاو فرۆکــە، تەنانــەت کــەتالۆگیکی روونکردنەوە بۆ ئەو مەبەستە هەیە، بە وینە ئاماژە بۆ ئەو بارە ئەکروپاتیە جیاجیایانە دەکات لە کاتی پرۆســەی سیکســدا لــە ئاودەســتی فرۆکــەی کۆمپانیــای فرۆکەوانیــە جیهانیــەکاندا دەتوانیــت بیکــــەیت. وینـــەکان بـــەپیی تەمـــەن و زەوق دەستنیشانی شوینی خۆراگرتن کراوە، کە نزیکەی ١٦٢ شیوەی رۆژئاواییە.

بەپیی ئەو کاتالۆگە، ئەو دەستگیرەی مرۆ لە کاتی بەکارهینانی ئاسایی ئاودەستا بەکاری دەبات، بۆ حەفتا و چوار مەبەستی دی دەست دەدات. بەم پییە ئاودەستی فرۆکە لایەنی چاکیی دیموگرافیەکەی لە هی ماشین باشترە. هەرچەندە ئامارگیریەکان وا دەردەخەن رۆژانە ژمارەی ئەو کیژۆلە زۆر زیرەکانە لە زیادیدایە و کەم ناکات کە لەناو ماشیندا سکیان پرکردوون.

ئەوانەی ئەزموونی ئەم بوارەیان هەیە لایان وایە ئاودەستی ناو فرۆکە جیگایەکی باو و ئاساییە بۆ سیکس ئەنجامدان، تەواو وەك چۆن سیناتۆرە کۆماریەکان جی خەوی تایبەتیان هەیە. بەلام جیگای نموونەیی لە فرۆکەدا شوین دانیشتنەکانە، دوای ئەوەی پالپشتەکەی نیوان هەردوولا لادەبریت. بەلگەی تەواویش ئەوەیە کە ئارنولد شوار زینگر پیشکەشی کرد، بەریز یونیفرسی جیهانی -کە جاران بە تیپەکەی تریان دادەنا- پیش سێ سال، لەگەل دەستگیرانەکەیدا، شەویك بۆ گەشت، لە لوس ئەنجلسەوە چوون بۆ نیویورك. پیدەچیت دەسگیرانەکەی نەیتوانیبیت بۆ

چرکەساتیکیش چاو لیك بنیت، ئەو کچەی لەناو فرۆکەکەدا میوانداریی دەکردن پاشان بە رۆژنامەکانی وت: "بە دریژایی گەشتەکە، تاقە شتیك لیم دیبن تەنیا قاچیان بووە".

کەواتە ئەو خوینەرەی کە لە یەکانتیەوە بۆم دەنووسیت: سیکس چاکترین چارەسەری ترسانی ناو فرۆکەیە راست دەکات. بە راستییش وەك زاناکان دەلین، سیکس چاکترین هیورکەرەوەی جەستەیە و هیچی تری پی ناگات. پاشان ئەگەر ئیمە باشتر بیری لی بکەینەوە، لە فرۆکەدا هیچ شتیك نییە بەلگەی قەدەغەکردنی سیکس بیت. جگەرەکیشان لە هەستانەوە تا نیشتنەوە قەدەغەیە. لە هەندیك شوینی فرۆکەدا، بە تایبەتی لە ئاودەستەکاندا، بەردەوام راگەیاندنیك ئەمەمان بیردەخاتەوە کە بە گلۆپ هەلدەبیت و دەکوژیتەوە. کەواتە ئەگەر پرۆسەی سیکسی قەدەغە بوایە بیگومان راگەیاندنیکی لەم بابەتەیان بۆ دەکرد، بەلکو لەوەیش زیاتر. لەو ترسە هەرە زۆرەدا کە من شەوانە بەسەر هەموو ئوقیانووسەکانەوە تووشم هاتووە، ئەوەندە خۆگر بووم کە چەند جاریك،

دەقی ئەو بەلیننامە چاپکراوەی سەر بلیتەکان بخوینمەوە کە کۆمپانیای فرۆکەوانی بە خەتی میکروسکوبی نووسیونی، لە هیچ بەندیکی ئەو بەلیننامەیەدا سانسۆر لەسەر کاری سروشتی هیچ ئەندامیکی لەش دانەنراوە. بۆیە، کە تا ئیستا سیکست لە فرۆکەدا نەکردووە لە تینەگەیشتنەوە بووە.

کەواتە بۆ پیشەوە و، سەفەر سەلامەت.

## فرۆکەی شۆخە نووستووەکە

کچە شۆخیکی بەلەباریکە، پیستە ناسکەکەی رەنگی نان و چاویشی لە دوو دەنکە چوالەی سەوز دەچوون. کەزیی نەرم و رەش و دریژی تا کەمەری هاتبوو. بۆن و بەرامەیەکی رەسەنی خۆرهەلاتی لیدەهات. ئیدی پولیڤی بیت یان فیلیپینی، هەرکامیکیان. هەر بە جلەکانیا شیك دیاربوو؛ چاکەتیکی کەتانی سپی، بلوزیکی ئاوریشمینی بە گولی تەواو پروکاو رازاوە. پانتۆل لە کەتانی رووت و پیلاویکی ریَ ریَ لەسەر باری دریژی بە رەنگی گولی بوگامبیلیا.

کە لە فرۆکەخانەی شارل دیگول لە پاریس، لە ریزی ئەوانەدا بینیم سواری فرۆکەی نیویورك دەبوون، بە خۆم وت: "ئەمە جوانترین ژنە لە ژیانما دیبیتم" و ریگام بۆ چۆل کرد، کە گەیشتمە لای

شوین دانیشتنەکەم، ئەوەی بە تایبەتی لەسەر بلیتی سەرکەوتنی ناو فرۆکەکە بۆ منیان دەستنیشان کردبوو، ئەوم لە تەنیشتمەوە بینی. بە هەناسەی سوارەوە لە خۆم پرسی: لەم ریکەوتە سەیرەدا کاممان بەدبەختین!

لە جیگاکەیدا وا سەقامگیر بوو وەك بلییت سالانیکی دریژ تیا دەمینیتەوە. هەموو شتەکانی بە وردی لە جیگای خۆیاندا دانا، تا بوارە تایبەتیەکەی خۆی بە تەواویی رەخسا، بە جۆریك دەستی بە هەموو شتەکان دەگەیشت. ئەوکاتەی سەرگەرمی کارەکانی بوو ئەفسەری کارگوزاریی شەمپانیای خۆش هاتنی پیشکەش کردین. ژنەکە شامپانیاکەی وەرنەگرت، ویستی بە زمانیکی فەرەنسی شەقوشر شتیکی حالی بکات. بەلام ئەفسەرەکە بە زمانی ئینگلیزی لەگەلیا دوا، بە زەردەخەنەیەك سوپاسی ئەفسەرەکەی کرد. داوای پەرداخیك ئاوی لیکرد و تکای ئەوەیشی لیکرد لە بەر هەر هۆیەك بووە تا دەگەنەجێ لە خەو هەلی نەستینن. پاشان جانتایەکی چوارگۆشە و گەورەی پیویستیەکانی لەسەر هەردوو ئەژنۆی پان کردەوە،

گۆشـــەی جانتاکـــە، وەك ســـنووقە ســـەفەریەکانی داپیرە لە برونز بوو. دوو حـەبی رەنگ ئالتوونی لـە شووشەیەك دەرهینا کە حەبی رەنگ جیاوازی تـری تیـابوو، هـەموو شـتەکانی لەسـەرخۆ و بـە بەرنامـە بـوون، وەك ئـــەوەی لـــە رۆژی لەدایکبوونیـــەوە وا راهـاتبیت. پاشان، سـەرینە چکۆلەکەی بـە لایـەکی پەنجەرەکەوە ناو بەتانیەکـەی تـا ناوقـەدی بەسـەر خۆیدا کیشا. لەسەرلا بێئەوەی پیلاو دابکەنیت، لە شـیوەی کۆرپەلەیـەکدا لەســەر جیگاکــەی راکشـا. هەرکە چاوی لیکنا یەکسەر خەوی لیکەوت، ئیتر بە دریژایی حەوت سەعاتی سامناك و دوانزە دەقیقەی زیاد لەو گەشتەی نیویورکدا لەسەر ئەو لایـەی کە کەوتبوو نەجوولا و نە دەنگی لیوەهات.

من هەمیشە ئەو بروایەم لابوە لـە سروشتا هیچ شتیك لە ژنی جوان جوانتر نییە. بۆیە نـەمتوانی بۆ چرکەساتیکیش لـە سیحری ئـەو شـۆخەی لـە پالما نوستبوو رزگار بم، خەوەکەی هیور و بیدەنگ بوو، تەنانـەت بـۆ کەمـەکیك تووشـی دلـەراوکیٚ بووم، تـۆ بلیی ئەو دوو حەبەی خواردی حەبی مەرگ نەبووبن نـەك هـی خـەو. چـەند جـاریك سـانتیمەتر بـە

سانتیمەتر لیی رامام. تاقە نیشانەیەکی ژیانی ئەو بۆ دلنیاییکردنی من سیبەری خەونەکانی بوو کە وەك پەلە هەوری سەرئاو بەسەر روویا تیدەپەری. زنجیریکی هیند ناسك لە گەردنیا بوو کە بەسەر پیستە ئالتوونییەکەوە بەحال دەبینرا، گویچکەی بۆ گوارە نەسمرابوو، ئەنگوستیلەیەکی ناسك لە دەستی چەپیدا بوو، لەبەرئەوەی من تەمەنیم بە بیست و دوو سال زیاتر دانەنا، بۆیە وام دلخۆشی خۆدایەوە کە ئەوە ئەنگوستیلەی دەزگیرانییەکی سەرپیی و شادمانی نییە. بۆنی هیچ عەتریکی لی نەدەهات، وەلی پیستەکەی بۆن و بەرامەیەکی هیند سووکەلەی لیدەهات تۆی بیگومان دەکرد کە ئەوە تەنیا بەرامەی سروشتیی جوانیە. "تۆ لە خەونی خۆتدا و، پاپۆریش لە دەریادا" لە بەرزایی بیست هەزار پیوە، بەسەر ئۆقیانووسی ئەتلەسیەوە، من وام بیرکردەوە. دەمویست یادی سوناتای خیراردودییگوی نەمر بە پیی ریزبەندیی شیعرەکەی بکەمەوە.

"دەزانم تۆ نوستویت، لەسەرخۆ و هێور، بە کۆچیکی وەفادارانە و هێلیکی بیگەردەوە، زۆر نزیك بە هەردوو دەستە بەستراوەکانمەوە"
حالەتە راستەقینەکەی من لە سوناتاکانی دەکرد، تەنانەت لە نیو سەعاتدا هەموو بینای قەسیدەکەم هینایەوە یاد: "من چ کۆیلایەتیەکی سامناك دەچیژم، شەونخونی و دیوانەی سەرکەندەکان، پاپۆرەکان لە دەریادا و، تۆیش لە خەونەکانتدا".
لەگەل ئەوەیشدا، پاش پینج سەعات لە فرۆکەوانی، کە زۆر لەو کچە جوانە نووستووە وردبوومەوە، بە ترسیکی زۆری بی ئومیدیەوە لە پرا هەستم کرد حالەتی مەعنەویم وەك سوناتای خیراردودییگو نییە، بەلکو وەك ئەدەبیکی تری گەورە و هاوچەرخە، مەبەستم رۆمانی -مالی کیژە جوانە نووستووەکانی- یاسوناری کاواباتای ژاپۆنیە.
من ئەو رۆمانە هەرەجوانەم لە ریگایەکی دریژو جیاوازەوە دەستپیکرد، وەلی بەهەرحال کۆتاییەکەی لای جوانە نووستووەکەی ناو فرۆکەکە

دیت، پیش چەند سالیك و لە پاریس، ئالان جوفری نووسەر بە تەلەفون پیی وتم حەزدەكات بە هەندیك لە نووسەرانی ژاپۆنی كە ئیستا لە مالیدان بمناسینیت، لەو كاتەدا تاقە شتیك لە بارەی ئەدەبی ژاپۆنەوە زانیبیتم، بیجگە لە قەسیدە خەمۆكەكانی های-كای كە لە بەرنامەی خویندنی دواناوەندیدا بوو، هەندیك كورتە چیرۆكی جونیشیر و تاینزاكی بوو كە كرابووە قشتالی. بە راستیش من شتیكی تەواو یەقینیم لەسەر نووسەرانی ژاپۆنی نەبوو بیجگە لەوەی كە هەموویان، ئەمرۆ بیت یان سبەی، كۆتاییەكەیان خۆكوشتنە. ناوی كاواباتام بۆ یەكەمین جار سالی ١٩٦٨ بیست كە خەلاتی نۆبلیان پیدا، ئەو كاتە ویستم شتیكی بخوینمەوە، بەلام بەسەر خویندنەوەكەوە خەوم لیكەوت، دوای ئەوەی خەلاتەكەی وەرگرت بە ماوەیەكی كەم لەسەر نەریتیكی تایبەتی بە شمشیریك ورگ و ریخۆلەی خۆی رادا، تەواو وەك رۆماننووسیكی تری بەناوبانگیان، ئوسانودازای، كە سالی ١٩٤٦ دوای چەند هەولیكی تری سەرنەكەوتووی بۆ خۆكوشتن، بەو مەرەیە چوو.

دوو سـال پیـش خۆکوشـتنەکەی کاواباتـا، ئـەمیش دوای چـەند هـەولیکی سـەرنەکەوتوو. یوکیومیشیمای رۆمـاننووس کـە لـە ئـەوروپادا لـە هـەموو ئـەوانی دی ناوبـانگی زیـاتر بـوو، دوای ئەوەی وتاریکی نیشتمانی بۆ سەربازانی پاسەوانی ئیمپراتۆری خویندەوە، بە ریگای تەواوی هاراکیری لـە خۆکوشـتندا خـۆی لـەناوبرد، بۆیـە، کـە ئـالان جوفری بۆ بینینی ئـەو نووسـەرانە پـەیوەندی پیوە کـردم ئـەوەی یەکسـەر بـە زەینمـدا هـات مـەرگ پەرستی بوو لای نووسەرانی ژاپۆن. پیم وت: "پیم خۆشـە بیـم بـۆ لایـان، بـەو مەرجـەی خۆنـەکوژن". وایـش دەرچـوو، کەسـیان خۆیـان نەکوشـت. بـە پیچەوانـەوە پیکـەوە شـەویکی زۆر خۆشمـان بەسەربرد، زۆرباش لەوەیش گەیشتم کە هـەموویان شـیتن، پییـان وتم: "هـەر لەبەرئەوەیـە دەمانـەویت بتناسـین" پاشـان بـە بروایـەکی زۆرەوە وتیـان خوینـەرانی ژاپۆنـی گومانیـان لـەوە نییـە کـە مـن نووسەریکی ژاپۆنیم.

بۆئـەوەی تـەواو لـە مەبەسـتەکەیان بگـەم، رۆژی دوای چوومـە کتیبخانەیـەکی تایبـەت لـە پـاریس،

هەموو کارەکانی شاساکوئزرو، کینزا بورو ئوی، یاسوشی ئانو، ئاکواتاگوار یونوسوکی، ماسوجی ئابوسی، ئوسانودازایم کری. ئەمە بیجگە لە بەرهەمی هەردوو نووسەری ناوداریان کاواباتا و میشیما. تا سالیك بیجگە لەوانە شتی ترم نەخویندەوە. تا خۆیشم گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە شتیکی هاوبەش لە نیوان رۆمانی ژاپۆنی و رۆمانەکانی مندا هەیە. شتیکە ناتوانم راڤەی بکەم. نەمتوانی لەو تاقە سەردانەیشمدا بۆ ژاپۆن لە ژیانی ئەویدا ئەو شتە بدۆزمەوە. بەلاّم بەلای منەوە زۆر ئاشکرا دیارە.

لەگەل ئەوانەیشدا، تاقە رۆمانیك کە حەزم دەکرد من نووسەرەکەی بوومایە رۆمانی مالی کیژە جوانە نووستووەکانی کاواباتا بوو، رۆمانەکە باس لە کریگرتەیەکی غەریبی دەوروبەری تۆکیۆ دەکات، لەویدا بورجوازیە پیرەکان پارەیەکی زۆر خەرج دەکەن بۆئەوەی چیژ لە پرۆسەی سیکس بکەن بە شیوازیکی تازەی داهینەرانە؛ شەوانە لە کچیکی جوان و رووتی شار رادەمینن کە لەسەر تەختی نووستنەکەیان راکشاون. ئەوان ناتوانن لە خەویان

هەستینن، تەنانەت دەستیان تیوە بدەن، هەر خۆیشیان ئەوە ناکەن. چونکە ئەوان بەوە تەواو بەختەوەر دەبن و چیژ لەو پیریەتییەی خۆیان وەردەگرن کە لە پال ئەو کچانەدا خەونی خۆش ببینن.

من لەم ئەزموونەدا ژیام کاتیك لە فرۆکەی نیویورکدا لە پال ئەو کچە جوانە نووستووەوە بووم. بەلام ئەزموونەکە دلخۆشی نەکردم، بەلکو بە پیچەوانەوە: تاقە شتیك کە لە دوا سەعاتی گەشتەکەدا بە هیوای روودانی بووم، ئەوە بوو ئەفسەری کارگوزارییەکە لە خەو هەلی بستینیت، بۆئەوەی ئازادی خۆم، رەنگە لاویەتیشم بەدەست بینمەوە. وەلی ئەوە نەهاتەدی، هەرکە فرۆکەکە نیشتەوە ئەو لە خۆیەوە لە خەو هەستا، دەموچاوی پاکژ کرد، هەستا بیئەوەی تەماشام بکات، یەکەمین کەس بوو لە فرۆکەکە بڕواتە دەرێ و بۆ هەتاهەتایە لەناو خەلکەکەدا ون بیت. من بە هەمان فرۆکە بەرەو مەکسیکو رۆیشتم. هەر لە تاسەی دیداریدا بووم کاتیك لە پال کورسیەکەیدا دانیشتبووم و جیگاکەی هالاوی گەرمایی نووستنەکەی لی

هەلدەستا. بیئـەوەی قسـەی نووسـەرە شـیتەکانی پاریسم لەسەر دەربچیت کە لە بارەی کتیبەکانمەوە دەیانوت، پیش ئەوەی فرۆکەکە بنیشیتەوە، کاتیك بلیتـی سـەفەرەکەمیان دامـێ، زۆرم هەسـت بـە ناخۆشی کرد کە بەم شیوەیە پرم کردەوە:

پیشە: نووسەریکی ژاپۆنی.

تەمەن: ٩٢ سال

## بەشێك لە ژیانی تایبەتیی گابریل گارسیا مارکیز

گابریل خۆزە گارسیا مارکیز Gabriel Marquez Jose Garcia لە شەشی مارتی ١٩٢٨ لە شاری ئارکاتاکا Arcataca لە باکوری کۆلۆمبیا لەدایك بووە، باپیر و نەنکی -لە دایکیەوە- لە ناو خیزانیکدا گەورەیان کرد پڕبوو لە پوور و ورتە ورتی گیانە ئەفسوناویەکان، بۆ زیاتر تیگەیشتن بە ژیانی مارکیز دەبیت سەرەتا بەشیك لە میژووی کۆلۆمبیا و پیشینەی خیزانی خۆیەوە دەست پیبکەن.

### کۆلۆمبیا

**Colombia**

ولاتی کۆلۆمبیا لە سالی ١٨١٠دا لەدەست داگیرکاری ئەسپانیا رزگاری بوو، لە باری یاساییەوە دیموکراسی لە ئەمریکای لاتیندا لە کۆلۆمبیادا سەقامگیر بووە. بەلام بە داخەوە ئەو دیموکراسیە بە دەگمەن تامی عەدالەت و ئاسایشی چیشتوە.

کاتێك کە ساڵی ١٨١٠ ناپلیۆن شای ئەسپانیای لابرد، ئەو دەوڵەتە جاری سەربەخۆیی خۆی لە ئەسپانیا دا و ماوەیەکی کەم ئەزمونی ئازادی کرد، پاشان لە ساڵی ١٨١٥دا جارێکی تر بە هۆی شەڕە خویناوییەکەی ژەنراڵ موریلو Murillo وە دەستی بە سەردا گیرایەوە. لە ساڵی ١٨٤٩دا کۆلۆمبیا پێشرەوییەکی زۆری کرد. بوو بە خاوەنی دوو حیزبی جیاواز، حیزبی پارێزگاران و حیزبی ئازادیخوازان. تا ئێستاش ئەم دوو حیزبە لە کۆلۆمبیادا دەستبەکارن. بوونەتە چوارچێوەی سیاسی گەلێك لە بەرهەمی چیرۆکەکانی مارکیز و دەرکی راستەقینەی ئەم حیزبانە رێنمایی بەرهەمەکانی ئەون.

لە تەواوی سەدەی نۆزدەدا، بە هۆی شۆڕش و شەڕی ناوخۆ و راپەڕینەکانەوە کۆلۆمبیا بارێکی نالەباری تووش هات. رەشەکوژی خەڵك لەم سەدەیەدا بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی هەزار رۆژە (The Wer of a thousand days) باپیری مارکیزیش بەشداری ئەم شەرە دەکات، گەلێك لە کۆنە سەربازانی ئەم شەرە وەك کەسایەتی خەیاڵی لە

بەرهەمــەکانی مــارکیزدا جیگــای شــیاوی خۆیــان دەدۆزنەوە.

کارەساتیکی تر کە کاریگەری لەسەر بەرهەمی مارکیز داناوە، بڕەوی بازرگانی مۆز و رەشەکوژی سالی ١٩٢٨ە، ئەم رووداوە لە رۆمانی سەد سال تەنیاییدا رەنگی داوەتەوە. لەو رووداوە گرنگانەی تر کە کاریان لە سەر بەرهەمی مارکیز داناوە، سەردەمی پڕ لە ترس و هەراسیکە بە ناوی (Laviolencia یان The Violence) ئەمە پاشان بووە باگراوندیك بۆ چەندین چیرۆکی کورت و لە هەموویان گرنگتر لە ساتە شوومەکاندا (Evil in Hour)دایە.

چ گومان لەوەدا نییە کە سەرەکی ترین کەسایەتی مارکیز باپیر و نەنکین لە دایکیەوە و، باپیری، سەرهەنگ Nicolls Ricardo miraguez Mejsa سەربازیکی کۆنەکاری ئازادیخوازی شەری هەزار رۆژە بوو، ئەو لە "ئاراکاتاکا" دەژیا، گوندیك کە خۆی دەستی هەبوو لە دروستکردنیدا، ئەم سەرهەنگە نیمچە قارەمانیك بوو، بەرانبەر رەشەکوژییەکانی شەری مۆز banana Massacrs هەروا

دەستەوستان دانەنیشت و لە سالی ١٩٢٩دا رەخنەی توندی لە کۆنگرەی کۆلۆمبیا گرت. ئەو کەسایەتیکی سەیر و سەرنج راکیش و لە حیکایەت خوانیشدا دەستیکی بالآی هەبوو، ژیانیکی سەرسورهینەری بەسەر دەبرد، لە تەمەنی لاویدا لە شەریکی تەن بە تەندا پیاویکی کوشتبوو، وەك دەلین زیاد لە شانزە مندالی بووە. لە بارەی شەریشەوە وا قسەی دەکرد دەتوت باس لە ئەزمونیکی خۆش و بە تام دەکات.

ئەم سەرهەنگە پیرە هەندیك لە فەرهەنگی زمان فیری گابریلی لاو دەکات. هەموو سالیك بۆ سیرکی دەبات و یەکەمین کەسە کە نەوەکەی خۆی بە کوشتنی خەلکی تر ئاشنا دەکات. ئەو بە مارکیزی لاو دەلیت هیچ کات و هیچ بەرپرسیارییەك لە کوشتنی مرۆڤیك قورستر نییە. پاشان مارکیزیش لە زمانی کەسەکانی ناو رۆمانەکانیەوە ئەم قسانە دەلیتەوە.

نەنکیشی لە هاوسەرەکەی کەمتر کاریگەری بەسەر بیری گابریلی لاوەوە نییە. بیری ئەویش وەك خوشکەکانی تری پرە لە خورافات و بیری خەلکی

رەمەکی. بەردەوام لە مالدا باس باسی چیرۆکی تارماییەکان، پیشبینی کردنی ئاینده و بەخت و بەدیومنیە کە سەرهەنگ زۆر گوییان پینادات. باپیری ئاگاداری گابریلی لاو دەکات کە بایەخ بەو جۆرە قسە پر و پوچانە نەدات. کەچی گابریل گویّ لە قسەکانی دایە گەورەی دەگریت چونکە دەستی بالأی هەیە لە چنینی ئەو درۆیانەدا.

دایە گەورە، بی گویدانە ئەوەی ئەو شتانە ناواقیعین و دوور لە راستین، وایان باس دەکات وەك ئەوەی تەواو راست بن، ئەمە هەمان شیوازی بی گیان و هەستە کە نزیکەی سی سال دوای ئەوە نەوەی ئەو ژنە بۆ گەورەترین رۆمانی -سەد سال تەنیایی- هەلی دەبژیریت.

گارسیا مارکیز لە سالأنی بەرایی تەمەنیا، کەم و زۆر بە باوك و دایکی بیگانە بووە. بەلگەکەیشی گرنگە، دایکی Luisa santiago lguarjin یەکیکە لە دوو مندالی خیزانەکە. ئەم کچە چالاك و جەربەزەیە حەز لە پیاویك دەکات بە ناوی Gabriel Elogoio Garcia، بەلأم دایکی کچەکە بە چاویکی سووك و نەفرەتیەوە لە گارسیا دەروانیت، یەکیك لە

پاساوەکانی ئەوەیە کە گارسیا پیاویکی پاریزکار و هەروەها (Le hoiarasca)یە. ئەم زاراوە سووکە بە وانە دەوترا کە تازە هاتبوونە شارەوە، واتا (گەڵای وشکەڵاتو) وەك هەر شتیك کە لە بەردەم بایەکی توندا سەرنگون بیت و لە گۆشەیەکدا فریێ بدریت.

گارسیا وەك میبازیکیش ناوی دەرکردبوو، باوکیك خاوەنی چوار مندالی ناشەرعی. بەلای سەرهەنگەوە گارسیا ئەو پیاوە نەبوو کچی ئەو بینیت، گارسیا بە سازی ڤیلۆن، شیعری عاشقانە، نامەی زۆر و تەنانەت پەیامی تەلگراف خۆشەویستی خۆی بۆ کچەکە دەردەخات. خیزانی کچە زۆر هەول ئەدەن کچەکەیان لە شەری ئەو پیاوە دووربخەنەوە، بەڵام ئەو دەستبەردار نابیت و، خیزانی گارسیا مارکیزیش لەوە دەگەن کە کچەکەیان بەلینی شووکردنی پیداوە. لە ئەنجامدا هەموو ناچار دەبن لە بەردەم پیداگرتن و سووربوونی کچەکەدا قایل بن و سەرهەنگیش بە ناچاری دەستی کچەکەی بخاتە نیو دەستی ئەو پیاوەوە. ئەم میردە تازەیە بۆ چاکبوونی پەیوەندی، لە شوینی لەدایکبوونی کۆنی

سـەرهەنگ ریـو ئاکـا Riohachaدا جیگــیر دەبیــت. رووداوە تال و شیرینەکانی سەردەمی دەزگیرانیەتی ئەو دوانە پاشان لە قالبیکی تازەتردا لـە رۆمانی - خۆشەویستی لە سەردەمی کولیردا– Love in the time of choletaدا شیوە دەگریت.

گـابریل لــەناو خــیزانیکدا لــەدایك دەبیــت کــە تەنگژەی مالی و گیروگرفتی ژیانیان هەیە. پاشان بە پیی ریورەسمی ئەوسا باپیر و نەنکی دەیبەنـە لای خۆیان و بەخیوی دەکەن.

ســالی ١٩٢٨ دوا ســالی بــرەوی مــۆزە لـــە ئاراکاتاکــادا. مــانگرتن و پاشــان تۆلەکارییــەکی بیبەزەییانە باری ئاسایشی شار تیکدەدات. تـەنیا لە شەویکدا زیاد لە سەد مان گرتوو لە ئاراکاتاکا دەکەونە بەر ریژنەی گوللە و لەناو دەچن، لاشەیان لـە گـۆری بـە کۆمـەلدا دەشـارنەوە. ئـەم کارەسـاتە خەماویە لە بەرهەمە ئەدەبیەکانی مارکیزدا رەنگیان داوەتەوە.

گــابریلی چکۆلــە کــە بــە نــاوی خۆمانـــەیی (Gabito)وە بـانگ دەکـرا، وەك مندالیکـی شــەرمن و کـەم دوو گـەورە بـوو. ئـەو عاشـقی چیرۆکـەکانی

باپیری و خورافەکانی نەنکی بوو. بیجگە لە سەرهەنگ و خۆی، ئەو مالە پربوو لە ژن، لە دواییدا گارسیا مارکیز لە بارەی بیروباوەری ئەوانەوە دەلیت: "هەندیك جار گفتوگۆکانیان ئەوەندەیان دەترساندم کە نەمدەویرا لەسەر کورسیەکەم هەستم "کەچی هەر ئەو مالە بووە سەرچاوە و جیگای داهینانی کارەکانی ئایندەی. کارەساتی شەری ناوخۆ و رەشەکوژی خەلکی، دلداریی باوك و دایکی، خورافاتی دایك سالار، هات و چۆی پوورەکانی، کچە ناشەرعییەکانی باپیری و.. هەموو ئەمانە لەو مالەوە سەرچاوەیان گرت. سالانیکی دواتر گارسیا مارکیز دەنووسیت: "من وا هەست دەکەم هەموو نوسینەکانم لە بارەی ئەزمونیکەوە بووە کە لە ژیانمدا لەگەل باپیر و نەنکم بەدەستم هیناوە".

کە تەمەنی گابریل دەگاتە هەشت سالی باپیری دەمریت، نەنکیشی رۆژ بە رۆژ چاوی کز دەبیت، بۆیە بە ناچاری گابریل دەگەریتەوە لای باوك و دایکی. باوکی گابریل لە دەرمانخانەیەکدا دەرمان دەفرۆشیت، کە گابریل دەگەریتەوە لایان یەکسەر

بریـــاری ئـــەوە دەدەن بیخەنـــە خویندنگایـــەکی رەسمیەوە. بۆیە دەینیرنە قوتابخانەیەکی ئیوارانە کـە دەکەویتـە بـارانکیلا (Baranguilla)وە، شـاریکی بـەندەری لـە ریژگـەی روبـاری ماگدالنـادا. لـەوێ گـابریل دەگۆریـت بـە کورژیلەیـەکی کـەم روو کـە شـیعری تـەنز دەلیـت و وینـەی کاریکاتـیری دەکیشـیت، ئـەوەندەیش جیدیـە لەگـەل لەشـی بچـووك و لاوازیشـیدا هاوپۆلـەکانی پیـی دەلیـن "پیرەمیرد".

سـالی ١٩٤٠ کـە تەمـەنی دوانـزە سـالە، بـە یارمـەتی ئـەو خـەرجی خویندنـەی کـە دەیدەنـێ دەرواتـە نـاوەندی قوتابیـانی زۆر زیرەکـەوە. قوتابخانـەی نـاوەندی The Liceo Nacional لـە لایـەن راهیبـانی یەسـوعیەوە بـەریوە دەچـوون، (یەسـوعیەکان ئـەو راهیبانـەن کـە سـالی ١٩٥٣ ئیگناتیوس لویلا دایمەزراند).

ناوەندیەکە دەکەویتە زیپاگویر Zipaguirەوە. ئەم شارە دەکەویتـە سـێ کیلۆمـەتری بـاکوری بوگوتـا Boogotaوە، گـابریلی لاو بـە سـەفەر دەرواتـە بۆگوتـا، سـەفەرەکەی هەفتەیـەك دەخایـەنیت. ئـەو کـە یەکـەم

جاریەتی بڕواتە پایتەخت، ئەو شارە وا دەبینێت کە خەمهێن و دڵتەنگ کەرە. ئەم ئەزموونە هانی گابریلی لاو دەدات کە شناسی خۆی بە ناونیشانی (costeo) دابنێت.

وانەکانی قوتابخانەی ناوەندی خۆشیەك بە گابریل دەبەخشن و هەموو دوانیوەڕوانیەك بۆ هاوڕێکانی ناوخۆیی بە دەنگی بەرز کتێب دەخوێنێتەوە و، عەشقی بۆ ئەدەبیات و چیرۆك و کاریکاتۆر ڕێگای ئایندەی بۆ ساز دەکات. هەر ئەو هۆیانەن دەبنە ئەستێرەی ڕێنماییکەری تا بتوانێت کەشتیی خەیاڵی بەرەو ڕاستەری ببات.

گابریل دوای تەواوکردنی قوتابخانەی لە ساڵی ١٩٤٦دا لەسەر حەزی باوك و دایکی و بە پێچەوانەی ئارەزووی خۆی کە ڕۆژنامەنوسیە لە بەشی حقوقی زانکۆی شاری بوگوتا ناونووسی خۆی دەکات. هەر لەو کاتەیشدایە کە هاوسەری ئایندەی هەڵدەبژێریت، ئەو کە بۆ دیدەنی باوك و دایکی دەچێت لەگەڵ کچێکی سیانزە ساڵیدا بە ناوی میرسیدس بارکا پارد و Mercedes Barcha Pardoدا دۆستایەتی پەیدادەکات. ئەو کچە گەنم

رەنگ و کەمدوو بنەچە میسریە، دلگیرترین کچیکە کە تا ئەوسا دیبوی، ئەو پیش رۆیشتنە زانکۆی، پشوە کورتەکانی لای دایك و باوکی بەسەر دەبردو هەر ئەوکاتەیش خوازبینی کچەکە دەکات. میرسیدس بەو مەرجە قایل دەبیت کە دوای تەواوکردنی قۆناغی ناوەندی خۆی ببنە دەزگیران. ئەگەرچی ئەوان تا چواردە سالی دوایی نابنە ژن و میرد، بەلاّم میرسیدس هەموو ئەو ماوەیە هەر بە وەفاداری دەمینیتەوە.

**گۆڤاری گولستانە، ژمارە ۲۱، سالی ۱۳۷۹.**

## وەسیەتنامەی گابریل گارسیا مارکیز

چەند سالیك لەمەوبەر، ماركیز تووشی شیرپەنجەی لیمفە رژێنەکان بوو، لەبەر باری تەندروستی لە ژیانی کۆمەڵایەتی دوورکەوتەوە، گوتاریکی مالئاواییشی پیشکەش بە هاوریکانی کرد، ئەمە دەقەکەیەتی:

ئەگەر خوداوەند تەمەنم دریژتر بکات، رەنگە هەموو ئەو شتانە نەلیم کە بیریان لی دەکەمەوە. بەلام پیشتر بیر لەو شتە دەکەمەوە کە دەمەویت بیلیم.

بەهای شتەکان بە پیی نرخی ماددییان هەلناسەنگینم. بەلکو مانایان دەکەمە مەحەك.

کەم دەخەوم و زۆر خەون دەبینم، ئەو تەنیا دەقیقەیەی چاوی تیا لیك دەنیین، شەست چرکە رووناکیمان لەدەست دەچیت. ئەو کاتانەی خەلکی دەوەستن من دەگەریم.

ئەوكاتەی خەلكی دەنون من رادەبم، كە ئەوان دەپەیڤن من گویرادەدیرم، چیژ لەو ئایسكریمە خۆشە دەكەم كە تامی شوكولاتە دەدات.

ئەگەر خوداوەند بریك كاتی ترم بۆ ژیان پی ببەخشیت جلوبەرگی سادە لەبەر دەكەم. لەشم لەبەرخۆردا هەلدەخەم و رۆحیشم والا دەكەم. خودایا.. ئەگەر كەمەكیك وەختم هەبیت بەشیك لە خۆم لەسەر بەستەلەك دەنووسمەوە و چاوەریی هەلهاتنی خۆردەكەم.

لەسەر ئەستیرەكان شیعری "بنیدتی" و خەونەكانی "ڤانكوخ" وینە دەكەم، یەكیك لە گۆرانیەكانی "سرات" دەچرم و پیشكەش بە مانگی دەكەم. بە فرمیسكی خۆم گولەكان ئاودەدەم، بۆ ئەوەی هەست بە ئازاری دركەكانی و ماچی گەلا سوورەكانی بكەم.

خودایا.. ئەگەر تەقدیر وا بیت ماوەیەكی تر بژیم، رۆژیك تەمەنم بە هەدەر نادەم كە بە خەلكی نەلیم خۆشم دەوین. هەموویانم خۆش دەویت. ژن و پیاویك ناهیلمەوە نەزانن لای من مەزنن، دەژیم وەك عاشقیكی شیت و شەیدا.

دەیسەلمینم هەموو ئەو مرۆڤانە هەڵەن کە وا دەزانن تا بە تەمەندا هەڵکشێن خۆشەویستیان نامێنێت. لە راستیدا.. ئەوان ئەو ساتە پیرن کە لە خۆشەویستی دەکەون.

جووتێ باڵ دەدەمە منداڵێکی چکۆڵانە تا بە خۆی فێری فڕین بێت. هەستی ئەوە لە تەمەندارەکان دەگەرێنم کە بە ساڵاچوون لە مەرگمان نزیک ناکاتەوە، بەڵکو، مەرگی راستەقینە لە فەرامۆشیدایە.

هۆ مرۆڤ.. من زۆر شتت لێ فێربووم، فێری ئەوەی هەموو دەمانەوێت لە ترۆپکی چیادا بژین، وەلێ بەختەوەر ئەو کەسەیە بە چیاکەدا هەڵدەزنێت، فێربووم.. یەکەمین جار منداڵ کە لە دایك دەبێت دەستی دەکاتەوە، ئیدی هەتا هەتایە دەستی لەگەڵ دەستی باوکیدا ئاویزان دەبن. فێری ئەوە بووم، مرۆڤێك مافی ئەوەی نییە لە سەرتاپای ئەوی دی بروانێت، مەگەر هاوکاریی رابوونی بکات، من ئەم هەموو شتانە لە تۆوە فێربووم، بەڵام داخ چ سوودیکیان بۆ من نییە، چونکە کاتێك فێری ئەمانە بووم کە لەسەرەمەرگدام.

ئەوەی هەستی  پی دەکەیت دەری ببرە، ئەوەی بیری لی دەکەیتەوە بیکە، ئەگەر بزانم  ئەمە دواجارە تۆ بە نوستوویی دەبینم، بە گەرمی لە ئامیزت دەگرم، خوازیاریشم لە یەزدان بمکاتە پاسەوانی رۆحت.

ئەگەر بزانم ئەمە دواجارە لە دەرگاوە بتبینم دەرۆیتە دەرێ، لە باوەشت  دەگرم و ماچت دەکەم، پاشان جاریکی دی هاوارت لی دەکەمەوە، تا لە ئامیزت بگرمەوە و ماچت بکەم.

ئەگەر بزانم ئەمە دواجارە گویم لە دەنگت دەبیت، وشە بە وشەت تۆمار دەکەم تا هەمیشە گویت بۆ رادیرم.

ئەگەر بزانم  ئەمە دوا چرکەساتی بینینی تۆیە، پیت دەلیم –من خۆشم دەوییت– بی ئەوەی گەلۆری بە خەرج بدەم کە تۆ بەمە دەزانیت.

هەمیشە سبەی بەریوەیە، ژیانیش هەلمان بۆ دەرەخسینیت تا شتەکان چاکتر بکەین.

ئەگەر هەلە بوبیتم و تەنیا رۆژیکم لەبەردەستا مابیت، هەرپیت دەلیم چەندم خۆشدەوییت، هەرگیزیش لە یادتان ناکەم.

کەسیك نییە، چ گەنج و چ پیر، دلنیا بیت لە هاتنی بەیانی. بۆیە لانی کەم دەبیت بجولییت، چونکە کە سبەی نەگەیشت، بیگومان تۆ زۆر پەشیمانیی ئەو رۆژە داتدەگریت کە دەرفەتت هەبوو بلییت خۆشم دەوییت. ئەوسا زەردەخەنەیەکت ناکەویتە سەرلیو تا ئامیزیك و ماچیك و دوا ئارەزووت بۆ ئەو کەسە بەدەست بینیت کە خۆشت دەویت.

**ئەم وتـارانە لەم دەقەوە وەرگیراون:**

**كيف تكتب الرواية ومقالات أخرى.**

**وەرگیری بۆ عەرەبی: صالح علمانی**

# پیرست